دوکتۆر شاکر خەسباک

# کورد و مەسەلەی کورد

ئەمجەد شاکەلی کردوویە بەکوردی

ناوی کتێب: کورد و مەسەلەی کورد
نووسینی: دوکتۆر شاکر خەسباک
وەرگێڕانی: ئەمجەد شاکەلی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٤٣
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: کارزان ئاوڕەحمان
هەڵەگری: هەندرێن شێرزاد
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی دووەم - هەولێر- ٢٠٠٥
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٠٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ.

**پێشکەشە**

بەبرا کوردەکانم کە مێژوویەکی درێژ و پڕ هاوکارییە بۆ وەدیهێنانی ژیانێکی باشتر، ئێمە و ئەوان براین و ئێستاش هەوڵ و کۆششی ئەوان و ئێمە یەکی گرتۆتەوە بۆ ئەوەی پێکەوە لە ژێر سایەی کۆمارێکی دیموکراتیی ئازاددا کە دادگەری بۆ هەمووان وەدی دێنێ، بژین. بەوان برا خۆشەویستانە ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم، ئومێدەوارم ببێتە خشتێکی پتەو لە بینای یەکیەتیی عارەبی - کوردیی سەربەرزدا.

بەغدا - کانوونی دووەمی ١٩٥٩
شاکر خەسباک

## پێشەکی

لەم ڕۆژگارەدا- کە عێراق بەسەردەمێکی نوێیدا تێدەپەڕێ- زۆر باسی برایەتی عارەب و کورد دەکرێت و عارەبەکانی باشوور و کوردەکانی باکور دەستیان بەوە کردووە بەڕاشکاوی ئارەزووی خۆیان بۆ بەردەوامبوون لە یەکیەتییەکەیاندا کە لە بارودۆخێکی خراپدا چێ بووە دەربڕن.

ئەم یەکیەتی عارەب- کوردە کە لە قووڵایی دڵی خەڵکەوە پشتگیریی لێ دەکرێ مەسەلەیەکە دڵ فێنک دەکاتەوە. جێگەی داخیشە کتێبخانەی عارەبی توانستی پێشکەشکردنی زانیاریی ڕوون و تەواوی لە بارەی کوردەوە بەبرا عارەبەکانیان نییە لە کاتێکدا کە هەزاران ساڵە لەم نیشتمانەدا و لەم دەوڵەتەیشدا کە پێش چل ساڵان دامەزراوە هاوبەشن. مەسەلەی کوردیش تا ڕادەیەک لەلای زۆربەی ئێمەی عارەب مەسەلەیەکی نەناسراوە. بۆ ئەوەی ماف و ئەرکی گشت نەتەوەیەک لەم وڵاتەدا دیاری بکرێن دەبێ بەڕوونی- لە کاتێکدا کە عێراقیش ئێستا لە سەردەمی سازکردن و نوێکردنەوەدایە- ئەو بنچینە زانستییانەی کە گەرەکە یەکیەتی عارەبی کوردیی لەسەر دامەزرێ دیاری و دەستنیشان بکەین و ئەو کارەش هەرگیز ناکرێت تا لە ڕاستیی مەسەلەی کورد و ڕاستیی پێوەندیی کورد بەو ناوچەیەی کە تێیدا دەژین تێنەگەین.

عارەب ئێستاکە بەقۆناخێکی کاریگەری مێژووی نوێیاندا تێدەپەڕن و نەتەوەی عارەبی ئازادیش ئەورۆ بووەتە ڕاستییەکی لەبەرچاو و خۆسەپێنەر بەسەر کۆڵۆنیالیزمی ڕۆژئاوادا. لەبەرئەوەی عێراقیش دەوڵەتێکە زۆربەی دانیشتوانی عارەبن کەوابوو دەبێ ئەویش هاوشانی دەوڵەتە عارەبییە ئازادەکانی دی بڕوات و نەخشەی ڕێگەی ئازادی و بزاڤی عارەبی و

پاراستنی بەدڵگەرمی و سووربوون و وریاییەوە بکێشی. بەڵام گرتنە بەری ڕێگەی ڕزگاریی عارەب دەبێ کارێکی وا نەکاتە سەر عێراق ئەوەی لەبیر بباتەوە کە ئەو (عێراق) نەک هەر تەنێ دەوڵەتێکی عارەبی نییە، بەڵکە دەوڵەتێکی عارەبی- کوردییە و مادامەکی هاوبەشیی عارەب و کورد لەم نیشتمانەدا دادگەرانەیە، دەبێ هێندەی خۆی (عێراق و عارەب) سوور بێ لەسەر نەتەوەی کورد. دانپێدانانی ئێمە لەم نیشتمانەدا هاوبەشین و ئێمە لە پلەی یەکەمدا عێراقین و لە پلەی دووەمدا عارەب و کورد. کۆکردنەوەی عارەب و کوردیش لە نێو یەک دەوڵەتدا هیچ داهێنان و بەدەوکارییەک نییە. لەنێو دەوڵەتانی ڕۆژئاوادا نموونەی زۆر هەن کە دەوڵەتگەلێکن لە پتر لە یەک نەتەوە پێک هاتوون و بەرژەوەندە هاوبەشەکانیان لە یەک دەوڵەتی یەکگرتوودا کۆی کردوونەتەوە و پێوەندیشیان لەسەر بناخەی پێکەڵی و دەستەبەرکردنی تەواوی هەریەکەیان و ڕێزگرتنی یەکدی دامەزراوە. لەم نامیلکەیەشدا هەوڵ دەدەین تیشکی مێژوو بخەینە سەر مەسەلەی کورد بۆ ئەوەی ڕێی ئەم یەکیەتییەی ئەمڕۆمان ڕۆشن بکەینەوە. بێگومان نوێ سەردەمیی عێراق خاڵی و بەدوور دەبێ لەو ستەم و هەڵەگەلەی کە لە کۆنە سەردەمی بندەستی و بەرژەوەندی کۆلۆنیالیزم و خۆپەرستیدا هەبوون و لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی یەکیەتی عارەب و کورد دەست پێ دەکات و پەردەی لەبیرچوونەوەش بەسەر ڕابردووی دزێویدا دادەداتەوە.

شاکر خەسباک

١

# کورد و کوردستان

## بنەچەی کورد

هەرچەندە زۆربەی لێکۆڵەرەوەکان لەسەر ئەوە یەک دەگرنەوە کە کورد سەر بەکۆمەڵی ئارییە Indo European و نووسەرانیش لە بارەی ڕیشەی وشەی کوردەوە جیاوازن بەڵام تا ئێستاش لە مەڕ ماکی کوردەوە دەمەتەقە هەر هەیە. لە بارەی وشەی کوردەوە دوو دیمانەی جێگرتوو هەن، یەکەمیان وشەکە دەگێڕێتەوە بۆ گوتو Gutu و دووەمیشیان دەیگێڕێتەوە بۆ کیرتی Kyrtii یا سیرتی Cyrtii.

دیمانەی یەکەم کورد بەگەلی گوتو Gutu وە گرێ دەدا و گەلی گوتوویش خەڵکانێک بوونە لە شانشینی گوتیام Gutium دا کە کەوتووەتە لای چەپی ڕووباری دیجلەوە لەنێوان ڕووباری زێی بچووک و ڕووباری سیرواندا، ژیاون. دوکتۆر سافراستیان و نووسەرانی دیکەش لەو بڕوایەدان کە ئەو وشەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووە تا گەییشتووەتە ئەو شێوەیەی ئێستای ئەویش بە لەنێوچوونی پیتی ر R دوای پیتی یوو U واتە Gurti بووە بە Guti. ئەو جۆرە سووانی پیتە ڕێسایەکی زمانەوانییە بەشێوەیەکی گشتی بەسەر زۆربەی زمانانی هیندی- ئارییەکاندا و بەتایبەت زمانە ڕۆژهەڵاتییەکانیانی وەک کوردی و ئەرمەنی و سانسکریتی و یۆنانی دەگرێتەوە[١].

دیمانەکەی دی کورد بەکیرتی Kyrtii یەکانەوە گرێ دەدا کە خەڵکێک بوونە لە ڕۆژئاوای زەریاچەی واندا ژیاون. نۆلدکە لەو باوەڕەدایە

کیرتییەکان بەزۆری بەسەر وڵاتی ئێران و میدیا و ئەو ناوچانەی ئێستا کوردی لێ دەژین بەشرابوونەوە و هەروەها لەو باوەڕەشدا یە کە وشەی کیرتیKyrtii یەکەم جار گۆڕاوە و بووە بەکورتو Qurtu و دواییش بووە بەوشەی کورت Kurt[٢].

درایڤەر کە لە ڕووی فیلۆلۆجی (زمانەوانی)یەوە لەبارەی بنجی وشەکەوە تۆژینەوەی کردووە هەرچەندە لە بەستنەوەی کوردەوە بەکیرتییەکان لەگەڵ نۆلدکەدایە بەڵام ئەو وشەی کورد دەگێڕێتەوە بۆ بنجێکی فارسی. درایڤەر لەو باوەڕەدایە ئەو فارسانەی نێوی کیرتییەکانیان بیستووە یا بەڕاستی دانوستاندنیان لەگەڵیاندا هەبووە ڕەنگە ناوێکیان لە کورد نابێ لە ڕووی دەربڕین و شێوەی گوتنەوە لە ناوە ڕەسەنییەکەی خۆیانەوە نێزیک بێت و لەگەڵ سروشتی ئازایانەیاندا گونجاو بێت.

وشەی کورد Kurd یا گورد Gurd ی ئێرانی کە ڕەنگە بنجیان لە وشەی گاردو Gardu یا کاردو Qardu ی بابیلیدا هەبێت واتەی «ئازا» «بوێر»، «جەنگ گێڕ» دەگەیەنێ. لەوانەیە وشە فارسییەکە دواتر لە نووسەرانی عارەبەوە گەییشتبێتە نووسەرانی ئەوروپایی[٣].

بۆ لێکۆڵەرەوە وا دێتە پێش چاو کە دیمانەی یەکەم لە ڕاستییەوە نێزیکتر بێت. لەوانەیە وشەی کورد لە دەربڕینی ئاشوورییانەی وشەی گوتو Gurtuواتە وشەی کورتو Gurtu وەوە هاتبێ، چونکە ئاشوورییەکان لەو گەلە فرە کۆنانەن کە وەک سۆمەرییەکانی پێشوویان ئەوانیش تووشی هێرش و پەلامارداني گۆتی Gutiیەکان بوون، ڕەنگە ئەوان ئەو ناوەیان گواستبێتەوە بۆ فارسەکان. لە ڕاستیشدا ڕەنگە گوردی Gurdu و کیرتیی Kirtii یەکان هەرچەندە لە خێڵی جیاواز پێکهاتوون سەر بەیەک گەل بن، چونکە ناوچەکانیان کە سۆمەرییەکان و ئاشوورییەکان و فارسەکان باسیان لێ کردووە هەر ئەو ناوچانەی ئێستای کوردستانن کە کوردستانی باکور و کوردستانی باشووریش دەگرێتەوە.

یەکەم شێوەی وشەی کورد کە وەک دەربڕینی ئێستا بێت و بۆ هەمان گەل

بگونجێت، وشەی کاردۆخی Kardouchi یە کە زینیفۆن لە بیرەوەرییەکانیدا دەربارەی ڤەگەڕانی دە هەزار کەسەکەی ساڵی ٤٠١ی پ. ز ناوی بردووە[٤].

واش پێدەچێ بنەمای ئەو وشەیەی کە زینیفۆن بەکاری بردووە وشەی گورتوو Gurtu بێت کە نیشانەی کۆ Kh Gurt- Kh ی ئەرمەنی خراوەتە سەر، ڕەنگە ئەم وشەیەش لە ئەرمەنییەکانەوە گەییشتبێتە یۆنانییەکان. پاشان ئەو وشەیە بەهۆی نووسەرانی کۆنی یۆنانییەوە گۆڕاوە و شێوەی جیاوازی وەرگرتووە وەک وشەی کوردونی Cordueni و گوردین Gor-dyene و کاردونی Cardeni و کوردونس Korduence و کوردینس Kordyens و گوردیای Cordyoei و کارداوی Qardaiwye و هتد[٥].

بەڵام بنەچەی کاردۆخییەکان کە زینیفۆن نێویان دەبات هەرچی بووبێت گورد و Gurdu بووبن یا کیرتی Kyrtii یا هەر شتێکی دیکە، بێگومان ئەوانە بەگوێرەی زۆربەی بەڵگەکان باپیرانی ئەم کوردەی ئەوڕۆن. وشەی کورد لە نووسینە فارسییەکاندا بۆ یەکەم جار لە کتێبێکدا بەزمانی پەهلەوی دەرکەوت. ئەرتەخشیری پاپەکان دامەزرێنەری دەوڵەتی ساسانی ساڵی ٢٢٦ ی. ز لە نێو نەیارانیدا نێوی مانگی Magi پاشای کوردان Kurdan ی بردووە[٦].

لەوانەیە نووسەرانی عارەبی وەک مەسعوودی و تەبەری وشەکەیان لە فارسییەوە هێنابێتە نێو زمانی عارەبییەوە. بەڵام ماکی ڕەگەزی کورد بابەتێکە لە ڕووی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە مافی خۆی پێ نەدراوە. شەرەفنامە کە یەکەم سەرچاوەیە لە بارەی کوردەوە دەدوێ باسی ئەوە دەکات کە هەندێک کەس لەو باوەڕەدان کورد نەوەی ئەو لاوانەن کە لە دەستی زوهاک ڕزگاربوون و نەکوژراون. زوهاک کە لەسەردەمێکدا شای ئێران بووە هەموو ڕۆژێک فەرمانی داوە مێشکی دوو لاوی بۆ ئامادە بکرێ بۆ ئەوەی تیماری کۆنە نەخۆشییەکی خۆی پێ بکات. بەڵام ئەو کەسەی بەرپرسیاری بەجێهێنانی ئەو فەرمانە بووە یەکێکی کوشتووە و

ئەوی دیکەی بەدزییەوە ناردووەتە چیا. ئیدی ژمارەیەکی زۆر لەو لاوانە، لەو کەژانە کۆدەبنەوە و گەلێکی هەمە جۆرەترووم پێک دێن کە نێوی کوردی لێ دەنرێ(٧).

ئەفسانەیەکی ئێرانیش هەیە دەڵێ کورد نەوەی دەستە کەنیزەکێکن سولەیمانی حەکیم لە ئەوروپا کڕیبوونی و لە ڕێگەدا لە چیاکان دێو و جنۆکە ڕێگەیان پێ دەگرن و دەیانکەن بە ژنی خۆیان و ئیدی ئەو گەلی کوردە نەوەی ئەوانن(٨).

هەندێک مێژوونووسی عارەب وەک مەسعوودی و هەندێک کوردیش لەو بڕوایەدان کورد لە بنەچەدا عارەبن و دەیانگێڕنەوە بۆ ڕەبیعەی کوڕی نەزاری کوڕی مەعاد یا بۆ موزەر (مضر) کوڕی نەزار کە خێڵێکە نیشتەجێی ناوچەی ڕەبیعەی دەڤەری مووسڵە یا ناوچەی موزەر (مضر)ی دەڤەری ڕەققەیە. ئەمانە دەڵێن کوردەکان بەهۆی ناکۆکییەک کە لە نێوانیاندا ڕووی داوە لە خێڵەکەیان جوێ دەبنەوە و بەرەو چیاکان کۆچ دەکەن و لەوێ لەگەڵ ڕەگەزی دیکەدا تێکەڵ دەبن و بەو جۆرە زمانی خۆیان لەبیردەکەن(٩).

بەڵام دیمانە جیدییەکان لە بارەی ڕیشەی کوردەوە پشت بەسێ بنچینە دەبەستن:

١- نەریت و تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکانی گەلی کورد.

٢- بەڵگە زمانەوانییەکان (فیلۆلۆجییەکان).

٣- تایبەتمەندییەکانی زمانی کوردی و بەڵگە مێژووییەکان.

**یەکەم**- هەرچی نەریت و تایبەتمەندییەکانی گەلی کوردە ئەوە بنەڕەتی دیمانەکەی مارە. مار لەو بڕوایەدایە کورد دانیشتوانی بنچینەیی چیاکانی ئاسیای بچووکن و لە هیچ شوێنێکی دیکەوە نەهاتوون، چونکە نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی کورد وەک نەریتی ئامۆزا خواستن و نەریتی گۆرانی چڕین. کە دەنگ لە گەرووەوە، دەرچێ وەک نەریتی ڕەگەزەکانی پێش خۆیانە.

هەرچەندە مار دان بەوەدا دەنێت کە ئەم زمانە کوردییەی ئێستا زمانێکی ئارییە، بەڵام ئەم دیاردەیە دەگێڕێتەوە بۆ کارتێکردنی تروومی هیندی-ئاری لەسەر کورد. مار دەڵێ تەنێ لەبەر وێکچوونی زمانی کوردی و زمانە ئارییەکانی دیکە، کورد بەئاری دابنرێ، کارێکی ناڕاستە، چونکە زمانی کوردی لە بنەڕەتدا زمانی خەڵکە ڕەسەنەکانە و گەلەک تایبەتمەندیی بنەڕەتیشی هەیە. هەروەها مار هەموو پێوەندییەکی نێوان کورد و گۆتییەکان یا کیرتییەکان دەداتە دواوە چونکە بەبۆچوونی ئەو ئەم پێوەندییە بەڵگەی مێژوویی نییە(١٠).

**دووەم-** ئەو دیمانەیەی کە پشت بە بەڵگەی فیلۆلۆجییەوە دەبەستێ نۆلدکە و هارتمان پشتگیریی لێ دەکەن. ئەم دیمانەیە کورد بەکیرتییەکانەوە دەبەستێ و هەوڵ دەدا ئەوە بسەلمێنێ کە وشەی کیرتی Kyrtii گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بووە بەوشەی کاردا Qarda و پاشان بووە بەوشەی کاردۆخی Kardouchi کە زینیفۆنی سەرکردەی یۆنانی بۆ یەکەم جار ناوی بردووە(١١) ئەوجا لەبەرئەوەی تەواوی بیروڕاکان لەسەر ئەوە پێک دێن کە کاردۆخییەکان کوردانی ئێستان و لەبەرئەوەی زۆر پێدەچێ کاردۆخییەکان سەر بەتروومێکی هیندی- ئاری بووبن، ئیدی گومان لەوەدا نییە کە کوردانی ئەوڕۆ هەر لەو تروومەن. لە ڕاستیدا ئەم دیمانەیە بەتەنێ پشت بەبەڵگەی زمانەوانی نابەستێ بەڵکە پشت بەوێکچوونی ناوچەی ڕوونیشتن و نەریتی نێوان کیرتی و کاردۆخی دەبەستێ. نووسەرانی کۆن باسی ئەوەیان کردووە کە کیرتی لە نێزیکی چیاکانی زاگرۆسدا لە ئێران لەو ناوچەیەی کاتی خۆی نێوی میدیا و لە دواییدا نێوی وڵاتی فارسی لێ نراوە، ژیاون.

سترابو و بولیبس و لیخی وا باسی کیرتییەکانیان کردووە کە کاریان دزی وتاڵانکردن بووە و لە بەردهاوێژتندا بە بەردەقانی گەلەک لێزان بوونە و زۆریش ئازا بوونە. ئەم جۆرە باسکردنە ڕێک وەک باسکردنی زینیفۆنە لە بارەی کاردۆخییەکانەوە. ناوچەگەلێک کە هەردوو ئەو گەلانەی تێدا

ژیاون وێک دەچن. وا دەردەکەوێ ئەم دیمانەیە پشت بە بەڵگەگەلی بەهێز ببەستێ.

بەڵام گرنگترین خاڵی لاوازی لەم دیمانەیەدا- وەک مینۆرسکی دەڵێ- روون نەکردنەوەی ئەوەیە کە چۆن کیرتی (یا کورد)ەکان توانیویانە لە ناوچەکانی رۆژئاوای چیاکانی توروس و ئەنتی توروسدا بلاو ببنەوە و بگەنە سەر سنوورەکانی سووریا[۱۲]. بەڵام وەرامدانەوەی ئەم بەرهەڵستییە و بۆچوونە ئاسانە، چونکە کیرتییەکان خەڵکێکی شوانکارە بوونە و شێوەی ژیانییان پاڵی پێوە ناون کە وەدووی لەوەڕدا بەناوچەگەلێکی بەریندا بلاوببنەوە.

**سێیەم**- دیمانەی سێیەم مینۆرسکی پشتگیریی لێ دەکات. ئەم دیمانەیەش پشت بەزانیاریی زمانەوانی و مێژوویی دەبەستێ. مینۆرسکی لەو باوەڕەدایە کورد لە رەسەنێکی ئارییەوە داکەوتوونەتەوە بەڵام تێکەڵ بەرەگەزی دیکە بوونە. ئەم دیمانەیە لە راستیدا لە زۆر رووەوە لەگەڵ دیمانەکەی نۆلدکەدا وێک دەچن و دیمانەکە هەم بناخەی مێژوویی و هەمیش بناخەی زمانەوانیی هەیە. دیمانەکە لە رێگەی لێکۆڵینەوەی زمانەوانییەوە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە زمانی کوردی دەگەرێتەوە بۆ کۆمەڵە زمانانی ئێرانی و مادام زمانیش بەڵگەیەکی گرنگە لە بارەیتروومی ئەوانەی کە پێی دەپەیڤن ئیدی بێگومان کورد لە رەسەندا ئارییە، هەروەها بەهۆی لێکۆڵینەوەی مێژووییەوە دەگاتە ئەنجامگیریی دۆزینەوەی ئەو رێگەیەی کە شەپۆلی کۆچکردووانی کورد بەنێو چیاکانی قەوقازدا گرتوویانە (رێگەی شەپۆلەکانی کۆچکردووانی ئارییەکان).

بەهەر حاڵ ئەو دیمانانەی کە باس کران هێشا پێویستییان بە پشکنینی ورد و بەڵگەی سەلمێن هەیە. رەنگە پشکنینە ئاسەوارناسی و پێوەرە وردکارییە ئەنتروپۆلۆجییەکانی لە بارەی کوردەوە دەستەبەری وەدەرخستنی تۆژینەوەی زانستی نوێ بن لە داهاتوودا لە بارەی رەسەنی کوردەوە. لای پشکنەر وا دەردەکەوێ ئەو دیمانانەی کە رەسەنی کورد دەگێرنەوە بۆ

کۆمەڵانی ئاری پەسند بن چونکە زانیارییە نوێیەکان بەردەوام بەڵگەی پشتگر بۆ ئەو دیمانانە دەردەخەن. هەندێک نووسەر دەڵێن یەکەم شەپۆلی ئاری کە کوردی لە ناوچەکانی ئاسیای ناوەندەوە گەیاندە ئەم ناوچانەی ئێستایان، نێزیکەی ساڵی ۲۰۰۰ پ. ز ڕووی داوە(۱۳). لەوانەیە گەلان و خەڵکانێک کە تایبەتمەندییەتی ئارییان تێدا بووبێت ئەو دەمە لەو ناوچەیەی کە لە زەریای ئیجەوە تا چیاکانی زاگرۆس و لە باکوری قەوقاس و زەریای خەزەرەوە تا کەنداوی فارسی درێژە دەکێشی، ژیابن و ڕەنگە ئەو گەل و خەڵکانە گەلانی مێژوویی ناسراوی وەک هیتییەکان و گۆتییەکان و میتانییەکان و کاشییەکان و عیلامییەکان بگرنەوە(١٤). لەبەرئەوەی ئەو شەپۆلە ئارییە شەپۆلێکی شاڵاوبەر بووە بۆیە دانیشتوانە بنچینەییەکانی تواندووەتەوە و زمان و ئایینی خۆی بەسەریاندا سەپاندووە. بەڵام تواندنەوەی تەواو بەهەرحاڵ وەدی نەهاتووە تا شەپۆلێکی دیکەی ئارییان دوای تێپەڕبوونی نێزیکەی هەزار ساڵ- کە ڕەنگە بەسەر قەوقاسدا بووبێت- هاتووە و ئەو ناوچانەی کە پێشتر باس کران، گرتووە(١٥). لەوانەیە کاردۆخییەکان کە زینیفۆن باسیانی کردووە نەوەی شەپۆلی دووەم یا ئەو وەچەیە بن کە بەرهەمی تێکەڵبوونی خەڵکانی شەپۆلی دووەم و دانیشتوانی ڕەسەنن، ئەوانەی لە وڵاتی کوردونس Corduence دا ژیاون. وڵاتی کوردونس Corduence ئەو ناوچەیەیە کە دەکەوێتە بەری چەپی ڕووباری دیجلە لە نێوان خابوور و زێی گەورەدا.

شەپۆلی یەکەمی ئاری دانیشتوانی ڕەسەنی تا ڕادەیەک تواندەوە و شەپۆلی دووەمیش توانی بەتەواوی- هەندێ کۆمەڵی دوورە دەست و گۆشەگیری لێ دەرچێ- بیانتووێنێتەوە. بەوەسفەکانی زینیفۆندا دەردەکەوێ کە دانیشتوانی کوردونس لەو سەردەمەدا هەندێ نیشانە و تایبەتمەندییەتیی ئارییان تێدا هەبووە بەتایبەت لەباری کۆمەڵایەتییەوە.

ئەو پێوانە ئەنترۆپۆلۆجییانە کە فیلد کردوونی ئەوە دەسەلمێنن کە جیاوازیی ئاماریی زۆر لە نێوان کوردانی عێراق و دانیشتووە عارەبەکانی

زەلکاوەکان و ئۆسێتەکانی دانیشتوانی قەوقاسدا هەیە[١٦]. لەلایەکی دیکەشەوە سیما و نیشانەکانی کوردانی باکوری دانیشتوانی تورکیا و باکوری ڕۆژئاوای ئێران کە نووسەران و گەڕیدەکان تۆماریان کردوون بەئاشکرا تایبەتمەندییەتی ئاریایەتی وەک سەری درێژ و بەژنی بەرز و ڕەنگ و ڕووی هویل (سوور و سپی) و پرچی کاڵ و چاوی شین دەردەخەن. بەڵام کوردانی کوردستانی خواروو ڕەنگ و ڕوو و پرچیان تاریک دەنوێنێ و زۆربەیشیان چاویان قاوەییە و بالایشیان مامناوەند و سەریشیان لە خڕییەوە نێزیکە. بەڵام ئەم جیاوازییە لە ڕووی نیشانەکانی ڕەگەزییەوە لە نێوان کوردی باکور و کوردی باشووردا ئەوە ناگەیەنێ کە کورد لە trووم و ڕەسەنی جۆراوجۆر پێک هاتبن، چونکە ئەو جیاوازییە کەمە بەرهەمی کاتێکردنی ڕەگەزەکانی نێزیکیانن. پێوانەکانی فیلد بۆ کوردانی ناوچە جیاوازەکانی کوردستانی عێراق ئەوەی سەلماند کە کورد دەچنەوە سەر یەک ڕەگەز. پشکنەر دەتوانێ بەهۆی پێوانە ئەنترۆپۆلۆجییەکانەوە و بەهۆی باسکردنی گەڕیدەکانەوە بگاتە ئەو ئەنجامەی کە کورد دەگەڕێتەوە سەر ڕەگەزی ئەلپ لە کۆمەڵە ئارییەکان. بەڵام باکورییەکانیان سیمای کارتێکردنێکی بەهێزی ئەرمەنییان پێوە دیارە و باشوورییەکانیشیان سیمای کارتێکردنی خەڵکانی زەریای نێوەڕاست- بەتایبەت سامییەکان- یان پێوە دیارە. هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر دیمانە لە بارەی باپیرانی کوردەوە هەن، بەڵام ئەو دیمانەیەی زێتر پەسندە ئەوەیە کە دەیانگێڕێتەوە سەر میدییەکان Medes. بنەمای ئەو بۆچوونەش ئەوەیە کە گۆتییەکان لە دوای گرتنی نەینەوا لە ساڵی ٦٦٠ی پ. ز دا تێکەڵ بەمیدییەکان بوون[١٧]. لە ڕاستیدا مێژوونووسانی کۆن لەسەر ئەوە پێک هاتوون کە گەلێک لە دەوروبەری دوو هەزار ساڵێک بەر لە زایین بە نێوی گۆتی هەبووە و ئەویش لە ناوچەیەکدا ژیاوە ئێستا یەکێکە لە ناوچە سەرەکییەکانی کورد.

بەڵام مێژوونووسان لەسەر ئەوەی گەلێک بەنێوی میدی کە خاوەنی تایبەتمەندێتیی خۆی بێت، پێک نەهاتوون. دوکتۆر سافراستیان بۆ

ڕەتکردنەوەی بوونی گەلێک بەنێوی میدی ئەوە دەکاتە بەڵگە کە ئەو مۆرە بزمارییانە پێشانیان داوە و ئاشکرایان کردووە کە وشەی Meda لە بنەڕەتدا بەواتای خاک یا وڵات هاتووە، وەک ئەوەی بگوترێ میدا گوتیوم بەواتای وڵاتی گوتیوم یا میدا عیلام بەواتای وڵاتی عیلام. بابیلییەکان، کە درەنگتر فەرهەنگی سۆمەرییان بەمیرات بۆ مایەوە، لە واتای وشەی میدا دا هەڵەیان کردووە چونکە ئەوان وایان دەزانی میدا ناوی وڵاتێکی دیاریکراوە یا نەتەوەیەکە لە نەتەوەکان، هەرچەندە نەشیاندەتوانی بەڕێکی ئەو وڵاتە یا ئەو نەتەوەیە دەستنیشان بکەن. ئاشوورییەکانیش هەر ئەو هەڵەیەیان لە بابلییەکانەوە بۆ مایەوە و ئێرانییەکان و یۆنانییەکانیش لە ئاشوورییەکانەوە بۆیان بەجێما و نووسەرە ئەوروپاییەکانیش لە نووسەرانی کۆنی یۆنانییەوە بۆیان ماوەتەوە(١٨). هەرچی گەلی گوتییە بەڵگەی زۆر هەیە کە هەبووە و وەک ڕەگەزێکی دیار و جیاواز ناسراوە.

ڕەنگە کۆنترین ئاماژەکردنێک بۆ گوتییەکان ئەوە بێ کە لە نووسراوە سۆمەرییەکاندا دۆزراوەتەوە. سۆمەرییەکان سکاڵایان لەوە دەکرد کە خەڵکێکی جەنگاوەر کە ناویان گۆتی بوو هەمیشە لە چیاکانیانەوە دەهاتنە خوراێ و پەلاماری بازێڕە سۆمەرییەکانیان دەدا. سۆمەرییەکان و ئەکەدییەکانیش دانیان بەوەدا نا کە شانشینێک بەنێوی شانشینی گۆتی هەبووە و پێتەختیشی ئەرابخوا بووە کە ڕەنگە ئەو شارە نێزیکی کەرکووک بووبێت(١٩). هەندێک نووسەر شوێنی شانشینی گوتییان لەو چوارگۆشەیەی دەکەوێتە نێوان زێی بچووک و ڕووباری دیجلە و گردەکانی سلێمانی و ڕووباری سیرواندا دەستنیشان کردووە(٢٠).

گۆتییەکان هەمیشە هەڕەشەیان لە ئاشوورییەکان کردووە و ئاشوورییەکان نێوی گاردۆ Gardu یا کاردو Kardu یان لێ نابوون، ئاشوورییەکان زۆر جاران دژی گوتییەکان جاڕی جەنگیان داوە بەڵام لەوەی کە وەژێریان خەن سەرنەکەوتوون. ئاشوورییەکان وەها باسی وڵاتی گۆتییەکانیان کردووە کە ئەو کەژانەیە کە دەکەونە ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلەوە لە نێوان هەردوو زێ

و ڕووباری سیرواندا ئیدی دوورنییە میدیا بۆ خۆی درێژەپێدانی وڵاتی گوتیوم Gutium بێ کە ڕەنگە کەوتبێتە باکوری ڕۆژئاوای ئێرانەوە. ئیدی هەرچۆنێک بێت ئێمەش لەگەڵ بۆچوونەکەی دوکتۆر سافراستیاندا ین کە گومان دەکات لەوەی خەڵکێک بەنێوی میدی و وەک گەلێکی جیاواز و تایبەت هەبووبن، چونکە بەڵگەی مێژوویی تەواو بۆ سەلماندنی بوونی وەها گەلێک نییە. لە ڕاستیشدا بەو جۆرەی هیرۆدۆتس باسی چێبوونی شانشینی میدی دەکات- ئەویش یەکەم سەرچاوەیە لە بارەی میدییەکانەوە کە خەڵکانی دی لەویانەوە وەرگرتووە- وەک خەیاڵ دێتە بەرچاو و قایلکەر نییە[٢١].

هەروەها مێژووی ئەم شانشینییەش نارِوون و تەماوییە. بەهەرحاڵ ئەمەش لەو ڕاستییە ناگۆڕێ کە ئەوە جەخت دەکاتەوە کە کوردانی ئێستا لەو وڵاتەدا کە ڕەنگە بەهەڵە نێوی میدیای لێ نرابێ ژیاون و لەبەر ئەوەش بەنەوەی میدییەکان دەژمێردرێن هەرچەندە ڕەگەزێکی تایبەتیش بەنێوی میدییەوە نەبووبێت. دەتوانین لەو بەڵگەیانەی تا ئێستا لەبەردەستدا هەن بگەینە ئەو ئەنجامەی کورد نەوەی گۆتییەکانن و ئەوان بەرهەمی تێکەڵبوونی دانیشتووە ڕەسەنەکانی چیاکانی زاگرۆس و شەپۆلی یەکەمی ئارییەکانن کە ناوچەکەیانی داگیرکرد.

## جوگرافیای کوردستان

لە بارەی جوگرافیای کوردستانەوە لێکدانەوەی زۆر کراوە. هەرچەندە زاراوەی کوردستان بەدەربڕینێکی ڕەگەزیانە بەگشتی دەکاتە ئەو وڵاتەی کوردی تێدا دەژی، بەڵام کەوشەنی جوگرافیایی ئەم زاراوەیە هەمیشە لەگەڵ لایەنە ڕەگەزییەکەدا وێک نەهاتووەتەوە. ڕەنگە کۆنترین سەرچاوە گەلێک کە زاراوەی کوردستانی تێدا دەرکەوتبێ سەرچاوە یۆنانییەکان بووبن. نووسەرانی یۆنانی و ڕۆم کوردستانیان ناو نابوو کوردونس Cor-duence یا گوردیای Gordiaea و سریانەکانیش ناوی کاردو Qardu یان لێ نابوو. مەبەستیش لەم ناوانە ئەو وڵاتە بوو کە کاردۆخییەکانی تێدا ژیاون- ئەو وڵاتەی دەکەوێتە نێو چیاکانی نێوان دیاربەکر و نەسیبین و زاخۆوە- هەرچەندە سنوورەکانیشی بەتەواوی ڕوون و ئاشکرا نەبوو[٢٢]. ئەو ناوچەیەش نەیدەکردە تەواوی ئەو وڵاتەی کە لە ڕاستیدا کوردی تێدا دەژیا. بەڵام نووسەرانی کۆنی عارەب کە باسی وڵاتی کوردیان دەکرد ناوە یۆنانییەکانیان بەکار نەدەبرد بەڵکە نێوی هەرێمی چیاکانیان لێ نابوو. ئەم هەرێمەش ئەو ناوچەیەی دەگرتەوە کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای ئێران تا دەگاتە ورمێ و لە دەشتاییەکانی عێراقەوە درێژە دەکێشێ تا بێ ئاوانی گەورەی ئێران و ناوچە چیاییەکانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئازەربایجان. هەرێمی چیاکانیش لە ڕاستیدا ڕێک ئەو ناوچەیەی دەگرتەوە کە نووسەرانی یۆنانی نێوی میدیایان لێ نابوو[٢٣]. مێژوونووسانی عارەبیش دواتر هەر ئەو ناوچەیەیان ناو نابوو عێراقی عەجەمی بۆ جوێکردنەوەی لە عێراقی عارەبی. بەڵام وشەی کوردستان وەک زاراوەیەکی جوگرافیایی وا پێدەچێ کە بۆ یەکەم جار لە سەدەی دوازدەیەمی زاییندا لە سەردەمی سەلجووقییەکاندا پەیدا بووبێت.

سوڵتان سنجار بەشە عارەبییەکەی هەرێمی چیاکانی جوێ کردەوە و خستییە ژێر دەسەلاتی سولەیمان شای خزمی خۆیەوە[٢٤]. ئەم ویلایەتە نوێیە بێجگە لەو ناوچانەی کە کەوتوونەتە ڕۆژئاوای چیاکانی زاگرۆسەوە

وەک شارەزوور و کۆیسنجەق، ئەو خاکەی نێوان ئازەربایجان و لوڕستان- سنە، دیناوەر، هەمەدان و کرماشان-ی دەگرتەوە[٢٥]. مێژوونووسانی عارەب دواتر ئەم زاراوە جوگرافیاییەیان بەکار هێنا و یەکەم جاریش لە کتێبی نوزهەتولقولووب (نزهة القلوب) دا کە ئەلموستەوفی ئەلقەزوینی (المستوفی القزوینی) لە ساڵی ٧٤٠ی کۆچیدا نووسیوویەتی کەوتە بەرچاو[٢٦]. وا پێدەچێ ئەم زاراوەیە پاشتر بڵاوکرابێتەوە و تەواوی میرنشینە دەرەبەگییە کوردییەکانی لە تورکیا و ئێراندا گرتبێتەوە[٢٧].

کتێبی شەرەفنامە کە میر شەرەفخانی بدلیسی لە ساڵی ١٥٨٦دا لەسەر داوای شا عەباسی دووەم نووسیوویەتی، وڵاتی کوردستان بەم شێوەیە دیاری دەکات: کەوشەنی کوردستان لە کەنارەکانی زەریای هورمز- یا کەنداوی فارسی نێزیکی-ەوە دەست پێ دەکات و بە شێوەی هێڵێکی ڕاست درێژە دەکێشێ تا ویلایەتی مەلاتییە (شاریکە لە ویلایەتی خەربووت لە کوردستانی تورکیا) و نەریش (شارێکە لە باکوری حەلەب) و لە باکوری ئەم هێڵەوە درێژە دەکێشێ و ویلایەتی فارس و عێراقی عەجەم و ئازەربایجان و ئەرمینیای بچووک و گەورە (ویلایەتی ئەدەنە- کلیکیا و ئەریڤان) دەگرێتەوە[٢٨]. لە سەردەمی دواتردا ویلایەتی کوردستان لە تورکیا پارێزگاکانی دیاربەکر و مووش و دەرسیمی دەگرتەوە[٢٩].

دوای دەمەتەقە لە مەڕ مێژووی فراژووتنی زاراوەی کوردستان مامۆستا مینۆرسکی دەگاتە ئەم ئەنجامگیرییەی کە «واتای جوگرافیایی زاراوەی کوردستان هەرچییەک بێت لەڕاستیدا شێوە و جۆری ڕاستەقینەی بەشینەوەی کورد پێشان نادات و وشەی کوردستان بەواتا باوەکەی یانی ئەو خاکەی کە کوردی تێدا دەژی»[٣٠]. هەرچەندە ئەو ئەنجامگیرییەی مینۆرسکی لە بارەی فراژووتنی زاراوەی کوردستانەوە پێی دەگات ڕاستە بەڵام ئەوە وەها ناگەیەنێ کە کوردستان وڵاتێکە بێ سنووری سروشتی و ڕەگەزی. لە هەڵکەوتدا کوردستانی ڕاستەقینە زاراوەیەکی هەم جوگرافی و هەمیش ڕەگەزییە. زۆر نووسەریش سنوورەکانی کوردستانیان دیاری

کردووە و لە هەموویشیان ڕوونتر دیاریکردنەکەی ئەدمۆندزە کە بەم شێوەیەی خوارەوە باسی دەکات: «سنوورەکانی لە باکورەوە بەو هێڵەدا دەڕۆن کە لە ئەریڤان و ئەرزەڕووم و ئازەربایجاندا درێژەی هەیە و پاشان وەک کەوانەیەک بەنێو ماراش (یا ماراس)دا بەرەو حەڵەب دەڕوا و بەرەو ڕۆژئاواش بەلاپاڵی چیاکاندا درێژ دەبێتەوە تا ڕووباری دیجلە و پاشان بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاوەڕۆی ڕووباری دیجلە دەڕوا و کەمێک لە باکوری کێوەکانی حەمرینەوە دەکشێت تا دەگاتە کەوشەنی عێراق- ئێران لە نێزیکی مەندەلی. بەڵام لە وڵاتی ئێران واتە لەبەری ڕۆژهەڵاتەوە سنووری کورد لە ئەریڤانەوە دەست پێ دەکات و بەرەو لای باشووری ڕۆژهەڵات دەڕوا و ناوچەکانی ماکۆ و بەشێک لە خووی و ڕەزائییە (ورمێ) و مەهاباد (سابلاخ) و سەقز و سنە تا دەگاتە کرماشان دەگرێتەوە و ئەو ڕێگەیەی نێوان کرماشان و کرند و مەندەلی سنوورێکە کوردە ڕاستەقینەکان لە خزمانی لوڕ و لەکیان کە هەندێ جار بەکورد دەژمێردرێن جیا دەکاتەوە»(٣١).

ئەگەر لوڕ بە کورد بژمێرین- وەک چۆن گەلێک بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی ئەوە دەسەلمێنن - ئەوا سنووری کوردستان بەدرێژایی چیاکانی زاگرۆسدا تا کەنداوی فارسی دەڕوا. بەو جۆرە بۆمان دەردەکەوێ کە کوردستان وەک زاراوەیەکی جوگرافی وڵاتێکی شاخاوییە و لە هەر شوێنێکەوە کە دەشتایی دەست پێ بکات- وەک نیکیتین ئاماژەی بۆ دەکات- ئیدی کورد لەبەرچاو بزر دەبن و جێگەی بۆ عارەب یا تورک یا ئێرانی یا ئەرمەن چۆڵ دەکەن(٣٢).

## ژمارەی کورد و ناوچەکانی ئێستایان

دەربارەی ژمارەی کورد خەملاندنی جیاواز کراوە. زۆر جاران ئەو خەملاندنانە گەلێک لەیەک دوورن. لە ڕاستیدا دانانی ژمارەیەکی ڕێک و تەواو کە ژمارەی کورد پێشان بدا کارێکە لە ڕووی ئامارگیری و سیاسییەوە سەختییەکی زۆری دێتە پێش. ڕەنگە گرنگترین خەملاندنگەلێک کە کراون ئەمانەی خوارەوە بن:

خەملاندنی کۆمیتەی کۆمەڵەی نەتەوەکانی ساڵی ١٩٢٥[٣٣]:

تورکیا ٢٠٠٠٠٠٠

ئێران ٧٠٠٠٠٠

عێراق ٥٠٠٠٠٠

سەرجەمی گشتی ٣٢٠٠٠٠٠

خەملاندنی ئەدمۆندز:

تورکیا ٢٠٠٠٠٠٠

ئێران ١١٠٠٠٠٠

عێراق ٩٠٠٠٠٠

دەرەوەی کوردستان ٥٠٠٠٠٠

سەرجەمی گشتی ٤٥٠٠٠٠٠

خەملاندنی نیکیتین[٣٤]:

تورکیا ٢ ٩٨٧ ٠٠٠

ئێران ١٣٠٠٠٠٠

عێراق ٧٤٩٠٠٠

سووریا ٢٨٩٤٩٠

ئەرمینیا ٦٠٠٠٠

سەرجەمی گشتی ٥٣٨٧٢٨٠

خەمڵاندنی محەمەد ئەمین زەکی(٣٥):

تورکیا ١٥٠٠٠٠٠

ئێران ٢٠٠٠٠٠٠

عێراق ٦٠٠٠٠٠

سووریا و ڕووسیای سۆڤیەتی ٢٣٠٠٠٠

پاکستان و بەلووجستان ٣٥٠٠٠٠

سەرجەمی گشتی ٤٨٦٠٠٠٠

خەمڵاندنی کۆمەڵەی خۆیبوون[٣٦]:

تورکیا ٤٠٠٠٠٠٠

ئێران ٣٠٠٠٠٠٠

عێراق ١٢٠٠٠٠٠

سەرجەمی گشتی ٨٢٠٠٠٠٠

وا دیارە خەمڵاندنی ئەدمۆندز، لە هەموو ئەوانی لە سەرەوە باسکران، پتر لە ڕاستییەوە نێزیک بێت. ئەدمۆندز لە خەمڵاندنەکەیدا پشتی بە نوێترین ئامارگەلێکی ئەو وڵاتانە کە مەسەلەکە دەیانگرێتەوە و لەبەر دەستیدا بووە بەستووە. بەڵام لە قرساندنەکەیدا لوڕی نەژمادووە لە کاتێکدا کە ڕای زۆربەی نووسەران لەسەر ئەوە یەکە کە لوڕ کوردن و دەکرێ ژمارەشیان بەزێتر لە نیو ملیۆن بخەملێندرێ. لەبەرئەوە دەشێ بگوترێ کە ژمارەی کورد لە کوردستان و دەرەوەی کوردستاندا لە پێنج ملیۆن کەمتر نییە.

ژمارەیەکی زۆری کوردیش لە دەرەوەی تخووبی کوردستان- واتە لە دەرەوەی سنووری تورکیا و ئێران و عێراق- بەتایبەت لە سووریا و ڕووسیای سۆڤیەت (لە ئەرمینیا و ئازەربایجان) دەژین، چەند کۆمەڵگەیەکی کوردییش لە دەرێی کوردستانی ڕاستەقینە لە تورکیا (بەتایبەت نێزیکی قۆنیە و سلیسیا) و لە دەرەوەی کوردستانی ئێرانیش

(بەتایبەت لە مازندەران لە نێزیکی کیلوێ عەبدو و دەوروبەری قەزوین) هەن. ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی دوورخستنەوە کە شاکانی فارس (بەتایبەت شا عەباسی دووەم و نادر شا) و سیاسەتی سوڵتانەکانی عوسمانی (بەتایبەت سولەیمانی قانوونی) لەگەڵ کورددا پەیڕەویان کردووە.

لەلایەکی دیکەشەوە ژمارەیەکی زۆر کەمینە هەن لە نێو کورددا لە کوردستانی ڕاستەقینەدا دەژین، بەتایبەت ئەرمەن لەو بەشەدا دەژین کە دەکەوێتە باکوری هێڵی بەرینیی ٣٨ و ئاشوورییەکانیش کە لە چیاکانی هەکاری و ورمێ دەژین.

کەوابوو کوردستان وڵاتێکە تخووبی سروشتیی خۆی هەیە و خەڵکەکەشی لە تروومێکی جیاوازن. بەڵام هەرچەندە سنووری سروشتیی خۆی هەیە، کەوشەنێکی سیاسی دەوڵەتی نییە، هەر بۆیەش لە ئەتڵەسە سیاسییەکاندا جێگەی تایبەتی نییە. کوردستان لەپێش جەنگی گەورەی یەکەمدا لە نێوان دەوڵەتانی تورکیا و ئێران و عێراق لەگەڵ چەند بەشێکی بچووک لە سووریا و ئەرمینیادا بەشرابۆوە، کوردەکانی تورکیا لەم سەردەمەدا زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانی پارێزگەکانی (ویلایەتەکانی) ئەرزەڕووم و سیڤاس و قارس و ئاگری و ڤان و مووش و سیرت و دیاربەکر و ماردین و ئورفە و ئەلعەزیز پێک دەهێنن[٣٧]. بەڵام لە ئێران کوردەکان تەواوی دانیشتوانی کرماشان و ئەردەڵان و هەندێک بەشی پارێزگە (ئوستان)ی ئازەربایجان پێک دەهێنن. لوڕیش دانیشتوی هەرێمی لوڕستانن. لە عێراقیش کورد بەزۆریی لە هەر چوار پارێزگەکانی باکور سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و مووسڵدا دەژین. هەروەها لە ناوچەی خانەقینی پارێزگەی دیالە دەژین. بەڵام پارێزگەی سلێمانی بەتەواوی پارێزگەیەکی کوردییە و پارێزگەی هەولێریش هەروایە تەنێ ئەوە نەبێ کە کەمینەیەکی تورکی لێیە. بەڵام پارێزگەکانی کەرکووک و مووسڵ تا ڕادەیەک نیوەی دانیشتوانیان کوردن. هەروەها کوردانی لوڕ لە پارێزگەکانی عیمارە و کووت هەن و ژمارەیەکی زۆری کوردیش لە بەغدا دەژین. کورد لە

دەرەوەی ئەو سێ دەوڵەتەی کـــە باسکران لە نێـــو سنووری یەکـــیـــەتی سۆڤـیـەتدا بەتایبـەت لە ئەرمـینیـا (ئەریڤـان) و ئەرداهان و کـاهیـزمـان لە دەوروبەری قـارس و زەنگسـۆر و جفـانهـیـر دەژین. لە سووریـاش کوردەکـان بەزۆری و بەتایبـــەت لە پارێزگـەی حـەڵەب (لە ناوچەی کـورداغ) و لە دیمەشق دەژیـن. بێـــجگە لەوانەش خـــێــڵی دیکەی کـــورد هەن کـــە لە ئەفغانسـتان و بەلووجسـتان و پاکسـتان دەژیین.

٢

# مەسەلەی کورد

## فراژووتنی مێژوویی مەسەلەی کورد

بۆ ئەوەی لە سروشتی مەسەلەی کورد تێبگەین دەبێ تەماشایەکی خێرای مێژوویی کورد بکەین. ڕەنگە مێژووی بندەستییەتیی کورد و کەوتنە ژێر دەسەلاتی بیانییان بگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی پ. ز کاتێک کە کوورەش لە ساڵی ٥٥٠ ی پ. ز دا توانی شانشینی میدیا بڕووخێنێ، کە مێژوونووسەکان بەزێدی ڕەسەنی کوردی دادەنێن. بەو شێوەیە وڵاتی کورد کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشییەوە. پاشانیش کاتێک ئەسکەندەری مەزن لە ساڵی ٣٣٠ ی پ. ز دا توانی ئیمپراتۆرییەتی هەخامەنشی بڕووخێنێ، ئەو وڵاتە کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی یۆنانییەوە. لە سەدەی دووەم و یەکەمی پ. ز دا ئەرمەنەکان توانییان دەست بەسەر وڵاتی کورددا بگرن تا ئەو کاتەی کە دەسەلاتداریەتی لە دەست ئەواندا نەما و کەوتە دەست ڕۆمانەکان و دەسەلاتداریەتی ئەوانیش تا سەدەی سێیەمی زایینی بەردەوام بوو. دوای ئەوەش ئیمپراتۆرییەتی ساسانی تا فەتحی ئیسلامی ساڵی ٦٤٠ی ز (١٨ی کۆچی) فەرمانڕەوایی کوردستانی کرد.

لە ڕاستیدا خێڵە کوردەکان بەتەواوی بندەستی ئەو دەوڵەتانە نەبوون، بەڵکە جۆرە سەربەخۆییەکیان هەبوو و پاڵیان بەچیا سەختەکانیانەوە دابوو، بەلام وڵاتی کورد بەهۆی شوێنگەی جوگرافییەوە کە تووشی جەنگی بەردەوامی کرد لە نێوان دەوڵەتانی ململانێکەردا بەتایبەت فارس و یۆنان و ڕۆمان و ئەرمەندا بەگران لەسەری کەوت.

لەسەردەمی فەرمانڕەوایی ئیسلامدا کورد بەشداریی گەلێک لە شۆڕشە ناوخۆییەکانیان کرد کە دژی حکوومەتی نێوەندەکی هەڵدەگیرسا.

کوردەکان جاربەجار دەیانتوانی لە دەڤەرە کوردییەکان یا لە دەرەوەیاندا دەوڵەتۆکەی کوردی سەربەخۆ دامەزرێنن. هەروەها توانییان فەرمانڕەوایی دەوڵەتۆکەگەلی ئیسلامیی پانوپۆڕ بکەن، کە بەناوبانگترینیان دەوڵەتۆکە گەلی ئەیووبی بوو کە لە ساڵی ١١٧١ی ز دا سەلاحەددینی ئەیووبی دایمەزراند و هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە سووریا و میسری دەگرتەوە. سەلاحەدین بۆ خۆی نۆرەیەکی مەزنی لە جەنگی خاچهەڵگراندا بینی و هەر ئەویش بەرپرسی لە نێوبردنی زۆربەی دەوڵەتانی لاتینی بوو کە خاچهەڵگران لە کەنارەکانی ڕۆژئاوای زەریای نێوەڕاستدا دایانمەزراندبوو(٣٨).

هەر لە سەرەتای سەدەی پازدەیەمەوە ئیدی دەوڵەتۆکە کوردییەکان لاواز بوون و لە وڵاتی کوردستاندا بەهاندانی هەردوو دەوڵەتە ململانێکەرەکانی ئێران و تورکیا سیستمێکی دەرەبەگیی هاتە ئاراوە. ئەم سیستمە بوو بەهۆی دامەزراندنی چەند میرنشینییەکی گچکە گچکە و پەرتوبڵاو لە وڵاتی کورددا کە سەرخێڵەکان فەرمانڕەواییان دەکرد(٣٩).

سیاسەتی حکوومەتی ئێرانی لە سەرەتادا بەو جۆرە بوو کە خۆ لە کاروباری نێوخۆیی خێڵە کوردەکان هەڵنەقورتێنێت. لە کوردستانی ئێراندا گەلێک میرنشینی دەرەبەگیی دامەزران و بەناوبانگترینیان میرنشینی ئەردەڵان بوو.

لە یەکێک لەو سەردەمانەشدا کوردەکان توانییان کۆنترۆڵی حکوومەتی نێوەندەکیی ئێران بکەن ئەویش بەوەی کە کەریم خانی زەند لە ساڵی ١٧٦٧ی. ز دا خۆی بەشای ئێران دانا. بەڵام شا قاجارییەکان کە دوای مردنی کەریم خانی زەند لە ساڵی ١٧٩٤دا یەک لە دوای یەک هاتنە سەر تەخت بەتوندی لە سەرکردەکانی کوردیان داو بەدەستێکی ئاسنین فەرمانڕەوایی خێڵە کوردەکانیان کرد و ئەوەش بوو بەهۆی لاوازبوون و بێ

دەسەڵاتییان وەک هێزێکی سیاسی تا ئەم نێزیکانە(٤٠).

بەڵام خێڵە کوردەکانی دانیشتوانی نێو دەوڵەتی عوسمانی گۆڕانکارییەکی زۆریان بەسەردا هات. لە سەرەتادا سوڵتان سەلیمی یەکەم دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٥١٦دا شای ئێرانی بەزاند داوای لە یەکێک لە ڕاوێژکارانی خۆی لە بارەی کاروباری کوردەوە مەلا ئیدریس کرد کە هەوڵ بدات بۆ وەدەستهێنانی پشتگیریی هۆز و خێڵە کوردەکان لە دەوڵەتی عوسمانی. لەو کاتەدا زۆربەی سەرۆکە کوردەکان زێتر سەر بەشای ئێران بوون. مەلا ئیدریس نەخشەیەکی وای دارِشت کە ئەوەی بۆ برەخسێنێ پشتگیری و مەیلی سەرۆکە کوردەکان بۆ حکوومەتی عوسمانی مسۆگەر بکات بێ ئەوەی ئەو سەرۆکە کوردانە واز لە دەسەڵاتی ڕاستەقینەیان بەسەر خێڵەکانیاندا بهێنن. مەلا ئیدریس لە سوڵتان سەلیمی یەکەم ئیزنی فەرمانێکی وەدەستهێنا بەگوێرەی ئەو فەرمانە سەرۆکە سەرۆکە کوردەکان نێوی حکوومەتە کوردییەکانیان لێ نرا. ئەو حکوومەتە کوردییانە بەگوێرەی ئەو فەرمانە بەحکوومەتەکانی هەولێر و کەرکووک و سلێمانی و حسن کیف (حصن کیف) و جەزیرەی ئیبن عومەر و هەکاری و ساسۆن و ئامێدی و بتلیس دیاری کران(٤١). هەرچی سەرۆکەکانی ئەم حکوومەتانەشن کە نێوی دەرەبەگیان لێ نرابوو، سەرپشکی و تایبەتمەندێتییەکی میراتگەرانەیان لە زەوی و زار و ناوچەی دەسەڵاتی خۆیاندا پێ درابوو و حکوومەتی عوسمانیش خۆی نەدەخستە نێو کاروباری نێوخۆی ئەوانەوە.

ئەم حکوومەتانە بەرپرسیار بوون لەوەی کە باجێکی دیاریکراوی ساڵانە بەحکوومەتی عوسمانی بدەن، هەروەها بەرپرسیاری ئەوەش بوون کە لە کاتی هەڵگیرسانی جەنگدا بە چەند سەربازێکی چەکدار بەشداریی لە سوپای عوسمانیدا بکەن.

بەو شێوە مەلا ئیدریس بەو نەخشەیەی خۆی پاراستنی سنوورەکانی تورکیای دژی هەموو پەلاماردان و هێرشێکی ئێران مسۆگەر کرد.

هەروەها توانی سەرۆکە کوردەکان بەوە قایل بکات کە بە قایلبوونیان بە پشتگرتنی حکوومەتی عوسمانی ئەگەر قازانج نەکەن ئەوا هیچ زیانیش ناکەن(٤٢). بەڵام هەرچەندە ئەم پرۆژەیەی کە مەلا ئیدریس نەخشەی بۆ کێشا بوو بە مەبەستی ملکەچکردنی خێڵە کوردەکان بۆ فەرمانڕەوایی عوسمانی نەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا گەیشتە ئەو ئەنجامە، چونکە حکوومەتە عوسمانییە یەک لە دوای یەکەکان ئەو پێکهاتنی خۆبەڕێوەبردنەیان لە بیر خۆ بردەوە و حکوومەتە کوردییەکانیشیان یەک لە دوای یەک قووت دا تا بارودۆخ گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمدا ژمارەیەکی کەم لەو حکوومەتە کوردییانە وەک حکوومەتی ئێزدییەکان لە شەنگار و میللییەکان لە دیاربەکر و زازا لە دەرسیم مانەوە و ئەوانیش نێوی سنجقبەگیان لێ نرا. ئەو حکوومەتانەش کە مابوونەوە حکوومەتی عوسمانی لێ نەگەڕا کە بەدەردی خۆیانەوە بمێننەوە بەڵکە بەردەوام هەوڵی دەدا بۆخۆی ڕاستەوخۆ داگیریان بکات.

ئیدی دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ناوچە کوردییەکەی خستە نێو سێ بەشلاقەوە کە بەغدا و دیاربەکر و ئەرزەڕووم بوون. بەڵام هەوڵەکانی حکوومەتی عوسمانی نەیتوانی تەواو سەر بەخێڵەکانی کورد شۆڕ بکات، شێوە سەربەخۆبوونێکی خۆیان هەر پاراست. هەروەها چەند میرنشینێکی کورد ئۆتۆنۆمییەکەیان لە ژێر پەردەی وەلائێکی رووکەش بۆ حکوومەتی عوسمانی، هەر مایەوە.

هەوڵدانی حکوومەتی عوسمانی بۆ داگیرکردنی ناوچە کوردییەکان و خستنیانە نێو ئیمپراتۆرییەتەکەیانەوە کز نەبوو بەڵکە بەتێپەڕبوونی کات بەهێزتر بوو. لە ساڵی ١٨٢٨دا سوڵتان موورادی دووەم ڕێکخستنە بەناوبانگەکەی خۆی بۆ بیناکردنەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەسەر بناخەیەکی نوێ بڵاوکردەوە و بەگوێرەی ئەو ڕێکخستنە دوا دەسەڵات و سەرپشکیی کورد لەنێو برا و لەبری سەرۆکە کوردەکان کە بەمیرات فەرمانڕەوایی ناوچەکانی خۆیان لە باوک و باپیرانەوە بۆ مابووەوە

فەرمانڕەوایی نوێی تورک لە ناوچە کوردییەکاندا دانران. ئەم هەنگاوە هاوڕێ لەگەڵ گوشارێکی زۆردا بۆ سەر خێڵە کوردەکان بۆ باجدان و سەربازدان بوو بە هۆی پەیدابوونی نارەزایی لە دەروونی سەرۆکە کوردەکاندا و ئەوەش پاڵی بەهەندێکیانەوە نا جاڕی شۆڕش دژی حکوومەتی عوسمانی بدەن. گرنگترین ئەو شۆڕشانە ئەوە بوو کە میر بەدرخان میری جەزیرەی ئیبن عومەر دەستی پێ کرد. لە ڕاستیدا بەدرخان تەنێ دژی حکوومەتی عوسمانی ڕانەپەڕیبوو، بەڵکە ئەو سەرکردەیەکی نیشتمانپەروەر بوو و ئامانجیشی ڕزگاریی کوردستان بوو لە زەبر و دەسەڵاتی تورک. بەدرخان نەخشەی ئەوەی دانابوو کە ئۆتۆنۆمی بە سەرۆکەکانی کورد و ئاشووری و ئەرمەن بدا(٤٣). گەلێک لە سەرۆکە کوردەکان لە دەوری بەدرخان کۆوەبوون و ئەوانەش کە نەیاندەویست لەگەڵیدا بن بەزۆر ناچار کران بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بن. حکوومەتی عوسمانی لە سەرەتادا هەوڵی دا مەیلی بەدرخان بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، بۆ ئەوەی لەو کارەی پەشیمانی بکاتەوە، بەڵام لەو هەوڵانەیدا سەرنەکەوت.

ئیدی هەر لە هەل دەگەڕا بۆ ئەوەی لە نێوی بەرێ، تا ئەوەی بۆ ڕەخسا، ئەویش کاتێک کە پێکدادان لە نێوان بەدرخان و ئاشوورییەکاندا ڕووی دا.

ئەو پێکدادانە بوو بە هۆی توورەیی و نارەزایی ڕای گشتیی ئەوروپایی دژی کورد. حکوومەتەکانی ڕۆژئاوا داوایان لە حکوومەتی تورک کرد کە بۆ پاراستنی خەڵکانی دیانی نێو وڵاتەکەیان (تورکیا) خۆ تێهەڵقورتێنن. ئەو پێکدادانە یەکەم پێکدادان بوو لە نێوان کورد و فەلەکاندا زۆر لەو نووسەرانەی کە کوردیان خۆشنەدەویست ئەوەیان بەکارهێنا بۆ ناوزڕاندنی کورد، بەڵام هەندێک نووسەری بێ لایەن ئەوە جەخت دەکەنەوە کە ئەو پێکدادانانە بەهۆی هاندانی ئاشوورییەکانەوە بوو لەلایەن حکوومەتی تورکەوە(٤٤). دەشێ ئەمەیان بۆچوونێکی دروست بێت. چونە بەدرخان دژ بەو نەریت و ئاکارانە بووە کە لە پلە و پایەی دیانەکانی کەم دەکردەوە، لە

ویلایەتەکەی خۆیدا پەیڕەویکردنی ئەو نەریتانەی قەدەغە کرد، ناشێ کەسێکی وەها بەوە تاوانبار بکرێت کە دەمارگیریی ئایینی دنەدەری بووبێ دژ بەدیانەکان. سەربارى ئەوەش نێوان کورد و هاوسێ دیانەکانیان هەمیشە خۆش بووە، نەبیستراوە کورد بەرامبەر پەیڕەوانی ئایینی دیکە، دەمارگیر بن.

حووکوومەتی تورک بەو هەلەی بۆی ڕەخسا، بۆ دەستتێوەردانی کاروباری بەدرخان خۆشحاڵ بوو و لەشکری تورک پەلاماری کوردی دا. بەڵام سوپای کورد زۆر جاران بەسەر لەشکری تورکدا سەرکەوتنی وەدەست دەهێنا. دوای جەنگێکی درێژخایەن کە چەند ساڵێک درێژەی کێشا سوپای تورک توانی بەدرخان دەستگیر بکات و سوڵتان بۆ شوێنێکی نێزیکی زەریای ڕەش دووری خستەوە و ئیدی دەنگوباسی برا. حکوومەتی تورک توانی قەڵاکانی سەرۆکە کوردەکان قەڵا لە دوای قەڵا بگرێت و تا لە ساڵی ۱۸۵۰دا تەواوی سەرۆکە کوردەکانی وەلا نا و گۆڕینییەوە بە فەرمانڕەوای تورک. پێش ئەوەی حکوومەتی تورک ئەو سەرکەوتنە وەدەست بهێنێ سوپای تورک جەنگێکی زۆری دژی سەرۆکە کوردەکان کرد. لەشکری تورک ڕووبەڕووی شۆڕشەکانی عەبدوڕەحمان پاشای بابانی ساڵی ۱۸۰٦و ئەحمەد پاشای بابانی ساڵی ۱۸۱۲و ئەحمەد پاشای ڕەواندزی ساڵی ۱۸٤۰بووەوە و هەموشیانی کوژاندەوە. بەڵام لە نێوبردنی میرنشینە کوردییەکان لەلایەن حکوومەتی عوسمانییەوە سەرکەوتنی کۆتایی و یەکجارەکی نەبوو بەسەر ڕۆحی نیشتمانپەروەریی کورددا، بەڵکە خێڵە کوردەکان لە یاخیبوون و ڕاپەڕینێکی هەمیشەییدا بوون و بەردەوامیش بوون لە باج نەدان و سەربازنەداندا. کە سەرەتای جەنگی تورک و ڕووس وەدەرکەوت سیاسەتی داپڵۆسینی تورک بەرامبەر خێڵە کوردەکان گۆڕا و دڵڕاگرتن و سازان جێگەی گرتەوە و ژمارەیەکی زۆری کورد کران بەسەرباز لە نێو لەشکری تورکدا. بەڵام هەر کە جەنگی ڕووسی- تورکی لە ساڵی ۱۸۷۷دا بەرەو خامۆشبوونەوە دەچوو ئیدی کوڕانی بەدرخان کە

سەرۆکایەتیی هێزێکی کوردییان دەکرد لەگەڵ بەشێکی زۆری ئەو هێزەدا گەڕانەوە بۆ دەڤەری بۆتانی خۆیان و لەوێ لە ساڵی ١٨٧٩دا جاڕی سەربەخۆیی خۆیاندا، بەڵام شۆڕشەکەیان زۆری نەخایاند و خێرا دامرکێندرایەوە(٤٥).

لە ساڵی ١٨٨٠دا شۆڕشێکی دیکەی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ عوبەیدوڵڵا لە ناوچەی شەمدینان بەرپا بوو. شێخ عوبەیدوڵڵا لە ناوچەکەی خۆیدا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو. ئامانجی ئەو دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ بوو کە بەشی خوارووی ویلایەتی ڤان و بەشی باکوری ویلایەتی مووسڵ بگرێتەوە بەمەرجێک بەناو لەژێر سەرپەرشتیکردنی تورکیادا بێت. عوبەیدوڵڵا لە دەستبەسەرداگرتنی ناوچەیەکی فرەواندا سەرکەوت و بڕێک بیرازیشی هێنایە گۆڕی کە دەبوونە هۆی نەهێشتنی تاڵان و دزی و ڕاووڕووت و هاندانی کشتوکاڵ و کاری چاک و بەرهەمدار(٤٦). بەڵام فەرمانڕەوایی شێخ عوبەیدوڵڵا بە هاتنەناوەوەی سوپای ئێران و گرتنی و دوورخستەوەی بۆ حیجاز کۆتایی هات. دژی حکوومەتی عوسمانی شۆڕشی دیکەی کورد هەڵگیرسا، وەک شۆڕشی بدلیس کە لە ساڵی ١٩١٢دا هەڵگیرسا، بەڵام هەموو ئەو شۆڕشانە تێکشکان. لە ڕاستیدا شۆڕشەکانی کورد تۆوی نوشوستی و تێکشکانیان هەر لە خۆدا بوو چونکە پشتیان بەباوەڕێک نەبەستبوو کە ئاکامی گەڵاڵەکردنی ئاگایی فەرهەنگی و سیاسی نێو کوردان خۆیانەوە بێت.

زۆربەی ئەوانەی کە ئەو شۆڕشانەیان دەکرد سەرخێڵەکان بوون و خێڵەکانیشیان گوێڕایەڵی فەرمانی وان بوون و هاریکاری نێوان سەرخێڵەکان بەشێوەیەکی گشتی لاواز بوو یا هەر نەبوو چونکە زۆربەی ئەو سەرخێڵانە بەهۆی دەسەڵات و سەردەستیی سیستمی دەرەبەگییەوە کە حکومەتی عوسمانی هانی دەدا دەستیان بەبەرژەوەندەکانی خۆیانەوە گرتبوو. بۆیە دەبینین هەر سەرخێڵێکی کورد بێ گوێدانە داوای سەرکردە

نیشتمانپەروەرەکان بەڕێگەی تایبەتی خۆیدا دەڕۆیشت. ئەم ڕاستییەش گەلێک ڕوونتر وەدەردەکەوێ کاتێک دەزانین کە زۆربەی ئەو شۆڕشانە بەهاریکاری سەرخێڵەکان و بەنیاز و ئامانجی کەسێتی خۆیان و دنەدانی حکوومەتی عوسمانی سەرکوت کراون. ئەو سەرۆکە کوردانەی ئامانجی نیشتمانپەروەرانە پاڵی پێوە دەنان لە چاو ئەوانەی کە گرنگییان تەنێ بە بەرژەوەندی تاکەکەسیی خۆیان دەدا کەمینە بوون. لە ڕاستیشدا ڕۆحی زێدپەروەریەتی بەواتا ئاگاییەکەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا ڕەسی ئەویش بەهۆی فراژووتنێکی ئابووری و ئاگاییەکی ڕێژەیی بیریی کە گشت وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی گرتەوە. کۆمەڵانی نەتەوە جوداکان دەستیان پێ کرد بێدار ببنەوە و قۆناخی ئاگایی نەتەوەیی کە وڵاتانی ڕۆژئاوا و نێوەڕاستی ئەورووپا پێش سەدەیەک و زێتر پێیدا تێپەڕیبوون تاقی بکەنەوە. لەو سەردەمەشدا تەنێ کورد نەبوون کە داوای سەربەخۆبیان لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرد، بەڵکە عارەب و ئەرمەن و خەڵکی دیکەش هەر ئەو ئامانجەیان هەبوو. داخوازیی لایەنە دیانەکان و بەتایبەت ئەرمەنەکان بۆ سەربەخۆیی تا دەهات خورتتر دەبوو و وڵاتانی ڕۆژئاواش لە داخوازییەکەیاندا پشتیوانییان لێ دەکردن(٤٧). سوڵتان عەبدولحەمید بەمەبەست کەوتە دنەدانی نەتەوەی کورد بۆ سازکردنی کۆمەڵەیەکی کوردیی جوێ و تایبەت لە نێو دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ ئەوەی ئەو کۆمەڵەیە پشتی حکوومەتی عوسمانی بگرێ و لە بازنەی سیاسەتی ئەودا بەڕێوە بچێ و دژی کەمینە فەلەکان بوەستێ. هەر لە ساڵی١٨٨١ یشەوە ڕۆژنامەکانی ئیستەنبووڵ دمگوێ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی کوردیی کە گوایە بە پشتیوانی حکوومەت دامەزرابێ بڵاو دەکردەوە(٤٨). هەر لەو کاتەشەوە ئیدی هەستی نیشتمانپەروەریەتیی کوردی بەپتربوونی ژمارەی خوێندووانی کورد هەر لە تەشەنەکردندا بوو. ئەدمۆندز پێشنیازی ئەوەی کرد کە ساڵی ١٨٩٢ بەنیشانەیەکی تایبەت لە مێژووی نەتەوەی کورددا دابنرێت چونکە لەو ساڵەدا بۆ یەکەم جار گۆڤارێک بەزمانی کوردی

دەرچوو[٤٩]. بازووی بزاڤی نیشتمانی کوردیش بەپەیدابوونی کۆمەڵەی یەکیەتی و پێشکەوتن (ئیتیحاد و تەرەقی) کە لە سەرەتادا نەتەوە جیاوازەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی هان دەدا، بەهێز بوو. کاتێک کە سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی ١٩٠٨دا لەسەر تەخت وەلا نرا بیری نەتەوەیی کوردی لەو سەردەمە کورتەی ئازادی و بڵاوبوونەوەی هەندێ چەمکی دیموکراتییەدا گەشەی کرد و یانەیەکی کوردی لە ئیستەنبووڵ دامەزرا و هەروەها پارتییەکی کوردیش بەنێوی پارتی هیوا پەیدا بوو.

چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی کوردیش دەرکەوتن کە گرنگترینیان ڕۆژنامەی کورت تاقاتف و ترقی گازیتسی (ڕۆژنامەی هاریکاری و پێشکەوتنی کوردی) بوو. ئەو گوتارانەی کە لەو گۆڤارانەدا بڵاودەکرانەوە گرنگیی ڕێکخستنی زمانی کوردیی وەک بەردی بناخەی یەکیەتی و پێشکەوتنی کورد لە کاروانی ژیاریی ڕۆژئاوادا جەخت دەکردەوە. بەڵام هەر کە کۆمەڵەی یەکیەتی و پێشکەوتن (ئیتیحاد و تەرەقی) دەسەڵاتی گرتە دەست ئارەزووە تۆرانییەتەکانی ئاشکرا بوو و ئیدی بیری نەتەوەیی کورد سەرلەنوێ تووشی گوشار و سەرکوتکردن بووەوە و ناچارکرا کە لە پشت پەردە و حەشارگەوە خۆ بشارێتەوە. کە جەنگی گەورە هەڵگیرسا، کوردەکان هاوشانی سوپای تورک جەنگان و زیانێکی زۆری گیانییان لێ کەوت و بوون بەخۆراکی جەنگ و نەخۆشی و برسیەتی.

بزاڤی نیشتمانپەروەریی کورد دیسان لە کۆتایی جەنگدا بەشێوەیەکی ئاگایانەی بەهێز سەری هەڵدایەوە. پێگەیشتنی چینێکی ناڤینی خاوەن ئاگایی سیاسی و شارەزا لەو سەردەمەدا یارمەتی ڕەسینی ئەو بزاڤەی دا.

گەلانی بندەستیش بەخۆشییەوە پێشوازییان لە بەرنامە بەناوبانگەکەی ویلسۆن بۆ ئاشتیی جیهانی کرد، کە تێیدا پرۆژەی چارەنووسی بۆ گەلانی بندەستی دەسەڵاتی عوسمانی پێشنیاز کرد. لەبەرئەوەی بەریتانیا بەڵێنی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی بەعارەب دابوو هەروەها ئەرمەنیش داوای دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان لە کۆنگرەی ئاشتی کردبوو

بەو جۆرە داخوازیی کوردەکانیش بۆ سەربەخۆیی وەک نەتەوەکانی ژێر دەستی فەرمانڕەوایی عوسمانی تۆمارکرا. کوردانی دانیشتوانی نێو تورکیا لەو کاتەدا چالاکانە کەوتنە کار و پڕوپاگەندەیەکی فرەوانیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد کە لە کوردستانی باکور و باشوور پێک بێت دەست پێ کرد. بۆ سەرۆکایەتی کوردستانی سەربەخۆ زۆر کەس ناودێر کران وەک سورەییا بەدرخان و عەبدوڕەزاق بەدرخان و عەبدولقادر شەمدینان و شێخ مەحموودی حەفید و جەنەراڵ شەریف پاشا.

یەکێک لەو ناودێراوانە کە جەنەراڵ شەریف پاشا بوو سەرۆکایەتی دەستەیەکی کرد بۆ کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس بۆ پێشکەشکردنی داخوازیی کوردان. ئەو دەستەیە بەپێکهاتن لەگەڵ دەستەی ئەرمەنیدا کاری دەکرد و هەردوو دەستەکە کۆشش و خەباتیان یەکخستبوو بۆ ڕزگاربوون لە دەسەلاتی عوسمانی. هەرچەندە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان چەند خاڵێکیان خستبووە نێو پەیمانی سیڤەرەوە کە بەپێی ئەو خاڵانە بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ لە باکوری ڕۆژهەلاتی تورکیادا درابوو(٥٠)، بەڵام ئەوان لە ڕاستیدا بەرامبەر بەداخوازیی کوردەکان دڵسۆز نەبوون(٥١). هەر لەو کاتەشدا چەند هۆکارێکی دیکە هەبوون کە کاریان دەکردە سەر هەڵوێستی کوردان خۆیان بەرامبەر بیری سەربەخۆیی کوردستان. تورکەکان ئەوپەڕی هەوڵ و کۆششی خۆیان خستە کار بۆ ڕاکێشانی کورد بەلای خۆیاندا و وەدەستهێنانی پشتگرییان و جوامێرانەترین و دڵفرەوانترین بەڵێنیان پێ دان.

ئیدی بەو شێوەیە پڕوپاگەندەی تورکی کە بەدرێژایی سالانی ١٩١٨ تا ١٩٢٣ بەردەوام بوو لە کپکردنەوەی دەنگی بیری نەتەوەیی کورددا سەرکەوت. کاتێک دەوڵەتە هاوپەیمانەکان جارێکی دی لەگەڵ حکوومەتی تورکدا لە ساڵی ١٩٢٣ بۆ دانانی پەیمانێکی نوێ ڕوونیشتن. هاوپەیمانان پشتگرتنی کوردیان پشتگوێ خست و تورکانیش بەڵێنە هەنگوینییەکانیان بۆ کورد پشتگوێ خست و بەو جۆرە پەیمانی نوێی لۆزان هاتە گۆڕێ و جێی

پەیمانی سیڤەری گرتەوە. پەیمانی لۆزانیش هیچ جۆرە ئاماژەیەکی بۆ ئاوات و داخوازییەکانی کورد تێدا نەبوو. تورکیاش کاتێک هێزی وەبەر هاتەوە و پێویستی بەپشتگریی و کۆمەکی کورد نەما ئیدی هەموو جۆرە بیرێکی لە مەڕ بەخشینی سەربەخۆیی بە بەشە کوردییەکە دایە دواوە.

تورکیا وای پێ باشتر بوو لە بڕی ئەوەی کە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کورد هەبێت و هەڕەشەی لێ بکات، کوردەکان بخاتە بندەستی خۆیەوە[٥٢].

دەوڵەتە هاوپەیمانەکانیش بەتایبەت بەریتانیا کە بەرپرسیار بوو هیچ شتێکی نەبوو پاڵیان پێوەنێ بۆ ئەوەی بایەخ بەئاواتەکانی کورد بدەن. لە ڕاستیدا سیاسەتی بریتانی بەرامبەر کوردان لەسەر ئەو بناخەیە بوو کە ویلسن بەم شێوەیەی خوارەوە باسی کردبوو: «بەهەموو دەستاوێژێکی گونجاو کە لە دەستماندا بوو ئامانجمان ساردکردنەوە و پووچکردنەوەی هەموو هەوڵێک بوو کە لەلایەن کوردەوە بدرێ بۆ جیابوونەوە لە فەرمانڕەوایی ئێران و ئامانجیشمان بەجێهێشتنی کوردانی دەرەوەی ویلایەتی مووسڵ بوو بەدەردی خۆیانەوە و هەر ڕەوتارێک کە حکوومەتی تورک بەرامبەریان بیکات»[٥٣].

هەڵوێستی بەریتانیا لە کوردانی دیکەی دانیشتوانی ویلایەتی مووسڵ کە لە ژێر دەستی خۆیدا بوون لە پێشدا ڕاڕا و بگۆڕ بوو بەڵان پاشان بڕیاری خۆی دا بەوەی ناوچە کوردنشینەکە بخاتە سەر دەوڵەتە عارەبییە نوێیەکە کە لە عێراقدا دامەزرا و لەژێر دەسەڵاتی ڕاستەقینەی خۆیاندا بوو. لە ڕاستیدا بەریتانیا بۆ وەدەستهێنانی قایل بوونی کۆمەڵەی نەتەوەکان بۆ ئەوەی ئەو بەشە کوردییە بخاتە نێو عێراقەوە جەنگێکی پڕوپاگەندەی فرەوانی دژ بەتورکیا گێڕا و لە ساڵی ١٩٢٧دا ئەو جەنگە بەسەرکەوتنی بەریتانیا کۆتایی هات. هەرچەندە بەریتانیا لە ڕاستییدا کۆمەکی بە عێراق دەکرد بۆ هێشتنەوەی ویلایەتی مووسڵی کۆن لە نێو خاکەکەیدا بەڵام بەڵگەکان ئەوە جەخت دەکەنەوە کە هەوڵدانی بەریتانیا بۆ وەدیهێنانی ئەو ئامانجە لە بۆ دەستگرتن بەسەر نەوتی ئەم ناوچەیەدا

بەپلەی یەکەم و بەهۆی هۆکاری کۆلۆنیالیی دیکەوە بوو[٥٤].

ئیدی بەو جۆرە لە پاش جەنگ کورد لە نێو سێ دەوڵەتدا کە ئەوانیش تورکیا و ئێران و عێراقن بەشرانەوە. بەڵام ئەم ئەنجامەش بەتەواوی دژی خواست و ئاواتە نەتەوەییەکانیان بوو.

## شۆڕشە نوێیەکانی کورد

بەشینەوەی کوردستان لە نێوان سێ دەوڵەتدا هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری شۆڕشی ناوچەیی، هەرچەندە هۆکارە ڕاستەوخۆکانی هەڵگیرساندنیان زۆرجاران بەهۆی بار و گوزەرانی کوردەکان خۆیانەوە بوو. ئەوەش کارێکی چاوەنۆڕکراو بوو بەتایبەت چونکە پشتگوێخستنی مافە نەتەوەییەکانی کورد لەلایەن ئەو حکوومەتانەوە لەلایەکەوە و تەشەنەکردنی ئاگایی سیاسی بەگەشەکردنی چینی خوێندوو لەنێویاندا بوونە هۆی هەڵگیرسانی ئەو جۆرە شۆڕشانە.

### لە تورکیا

لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا سێ شۆڕش لە تورکیا بەرپا بوو، یەکەمیان شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران بوو لە ساڵی ١٩٢٥دا. هۆیەکانی ئەم شۆڕشە فرە بوون بەڵام بێگومان هۆکاری ئایینی نۆرەیەکی گرنگی گێڕا لە هەڵگیرسانیدا. شێخ سەعید کە بۆخۆی پیاوی ئایین بوو و لە نێو خێڵەکەیشیدا گەلێک دەمڕاست و دەستڕۆیشتوو بوو، ئەو هەنگاوگەلەی حکوومەتی کەمالی نای، بەتایبەت ئەوانەی ئامانجیان لاوازکردنی ئایین بوو یەکجار کاریان تێ کرد[٥٥]. بەڵام ڕاستی هۆبە ڕاستەوخۆکانی شۆڕشەکە هەرچی بووبێت، نیشتمانپەروەرە کوردەکان بەکاریان هێنا و کردیان بەشۆڕشێکی گشتی بۆ وەدەرنانی تورک لە کوردستان. بەڵام ئەو بەرنامەیەی بۆ شۆڕشەکە داڕێژرابوو بەگوێرەی ئەو نەخشەیەی بۆی کێشرابوو بەهۆی ئاشکرابوونیەوە ئەنجام نەدرا و چەند خێڵێکی کەمی کورد لەگەڵ خێڵەکەی شێخ سەعیددا بەشداریی شۆڕشەکەیان کرد. لە دواییدا بەسەختییەکی زۆر و زیانێکی زۆری گیانی حکوومەتی تورک توانی شۆڕشەکە دامرکێنێ.

ئاگری شۆڕشی دووەم لە نێوان ساڵانی ١٩٢٧ و ١٩٣٠دا

بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ ئیحسان نووری پاشا هەڵگیرسا. هۆی ڕاستەوخۆی هەڵگیرسانی ئەم شۆڕشە ئەو کارانە بوو کە حکوومەتی تورک دەستی بەجێبەجێکردنی کردبوو بۆ تورکاندنی کورد و کەمینەکانی دی. ئەویش لە ڕێگەی هەڵوەشاندنەوە و پووچاندنەوەی زمان و نەریت و کەسایەتیی نەتەوەییان(٥٦): بەڵام کوردەکان کە شانازی بە نەتەوەی خۆیانەوە دەکەن سەریان بۆ ئەو سیاسەتی تورکاندنە دانەنەواند و ئەوەش بوو بەهۆی هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشی بەهێز و فرەوان. حکوومەتی تورکیش توندوتیژترین ئامرازی بەکارهێنا بۆ دامرکاندنی ئاگری ئەم شۆڕشە و لە کارەکەیشیدا سەرکەوت.

شۆڕشی سێیەم لە ساڵی ١٩٣٧دا لە هەرێمی دەرسیم هەڵگیرسا. سافراستیان هۆی ئەم شۆڕشە دەگێڕێتەوە بۆ ئەنجامدانی ئەو کاری سەرکوتکردنانەی کە حکوومەتی تورک دژی هەندێ لە سەرخێڵەکانی ئەو ناوچەیە کردی(٥٧). بەڵام ئەلفینستۆن هۆی ڕاستەوخۆی ئەو شۆڕشە دەگێڕێتەوە بۆ بڵاوکردنەوەی قانوونێک کە ئامانجی تورکاندن و تواندنەوەی کەمینە ناتورکەکان بوو لە نێو گەلی تورکدا(٥٨). بەرگریی خێڵەکان دوو ساڵ درێژەی کێشا بەڵام بۆمبارانی سەختی ناوچەکە سەرخێڵەکانی ناچار کرد کە خۆ بەدەست هێزەکانی حکوومەتەوە بدەن و ئیدی دوازدە کەسیان لە سێدارە دران.

ئەلفینستۆن لە بارەی شۆڕشەکانی کوردەوە وەها دەڵێ: «بەگوێرەی ئەو بەڵگانەی لەبەر دەستماندان دەردەکەوێ کە سیاسەتی حکوومەتی تورک یەکەم لەلایەن سەرخێڵە دەرەبەگەکانەوە بەرەنگاریی دەکرا و دووەم لەلایەن سەرۆکە ئایینییەکانیشەوە بەرهەڵستی دەکرا. بێجگە لەوەش سیاسەتی تورک کوردەکانی وورووژاند و بزواند کاتێک کە ترسی لە دەستدانی کەسایەتی نەتەوەییان لێ نیشت. بێگومان ڕۆحی نیشتمانپەروەریەتی نۆرەی دیاریکراوی خۆی لە پشتی ئەو شۆڕشانەوە دەبینی»(٥٩).

## له ئێران

له ئێران کەمتر شۆڕش ڕووی دەدا. گرنگترین شۆڕشێک کە لە ئێراندا ڕوویدابێ ئەوە بوو کە سمکۆ (ئیسماعیل ئاغای شکاک) پاش جەنگی مەزنی یەکەم بەرپای کرد و ئامانجیشی سەربەخۆیی کوردستانی ئێران بوو. بەڵام ئەو شۆڕشە زۆری نەخایاند چونکە لە یەک کاتدا تووشی بەرەنگاربوونەوەی هەردوو حکوومەتی ئێران و حکوومەتی ئینگلیز بووەوە لە پاشاندا ناچارکرا لە سنووری عێراق بپەڕێتەوە و خۆی بدا بەدەست دەسەڵاتداریەتی ئینگلیزەوە و ئەمانیش دایانە دەست ئێران.

بەڵام شۆڕشی گرنگی دووەم شۆڕشی قازی محەمەد بوو کە لە ڕاستیدا شۆڕشێکی ئاشتیخوازانە بوو. پارتی دیموکراتی کورد لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٤٥دا بانگی دامەزراندنی حکوومەتێکی میللی کوردی هەڵدا و لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٦دا قازی محەمەد بەسەرۆکی ئەو حکوومەتە هەڵبژێردرا. حکوومەتی قازی محەمەد یا کۆماری مەهاباد وەک ناونرا تەنێ یەک ساڵ ژیا بەڵام لەو ماوە کەمەدا توانی گەلێک بیراز، بەتایبەت لە باری کشتوکاڵ و فەرهەنگ و کارگێڕییەوە، ئەنجام بدا. قازی محەمەدیش بۆ خۆی لەبیر و بۆچوون و داخوازییەکانیدا مرۆڤێکی میانڕەو بوو وەک ڕۆزڤێلتی بچووک باسی دەکات وا دەردەکەوێ قازی پیاوێکی خاوەن بیروباوەڕێکی پتەو و قایم بووە لەگەڵ ئازاییەکی کەم وێنە و خۆبەختکردنێکی مەزن بێجگە لەوەش فرەوانی ئاسۆی بیر و میانڕەوی شێوەی بیرکردنەوەی(٦٠). زۆربەی داخوازییەکانیشی بۆ ئۆتۆنۆمی بوو. بەڵام حکوومەتی نێوەندکیی ئێران بەو داخوازییانە قایل نەدەبوو. دوای دانوستاندنێکی زۆر لە نێوان قازی و حکوومەتی نێوەندەکیدا کە لە پێشدا وای پێشان دا بە ڕەوشی وەپێشهاتوو قایلە سوپای ئێران بەبیانووی پاراستنی ئەو هەڵبژاردنەی کە لەسەر ئەنجامدانی پێکهاتبوون هاتە نێو مەهابادەوە و قازی محەمەد و ئەندامانی وەزارەتەکەی گیران و پازدە کەسیان لە سێدارە دران. بەڵام دامرکاندنەوەی براڤەکەی قازی محەمەد

نەبووە هۆی کوژاندنەوەی ڕۆحی نیشتمانپەروەریەتی لە دەروونی کوردانی ئێراندا. دادپرسی ئەمەریکی ویلیەم دۆگلاس لە بارەی ئەم ڕاستییەوە وەها دەڵێ: «لە سێدارەدانی ئەم قارەمانە کوردە بوو بەهۆی مردنی ئەم پیاوە نەک لە نێوچوونی بیری نەتەوەیی کوردی، لە ڕاستیشدا مردنی ئەو هێزێکی پاڵپێوەنەری نوێی بەم بیرەبەخشی»(٦١).

## لە عێراق

لە عێراقدا گەلێک شۆڕشی کورد دژ بەدەوڵەتی نوێی عێراق ڕووی دا و هۆیەکانیشی تێکەڵاوییەک بوون لە هەستی نیشتمانپەروەریەتی و گازندە و گلەیی ناوچەیی و گوێ نەدانی حکوومەتگەلێکیش کە کۆلۆنیالیستانە ئاراستە دەکران بەداخوازییە نەتەوەییەکانی کورد. شۆڕشە یەکەمەکان شێخ مەحموودی حەفید ڕێبەرایەتی دەکردن و لیوای سلێمانیش نێوەندی ئەو شۆڕشانە بوو. لە سەرەتای سەردەمی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە شێخ مەحموود کرا بەحوکمداری کوردستان (ناوچەی سلێمانی) و ئۆتۆنۆمییەکی پێ درا. شێخ مەحموود لە دەستپێکدا هەوڵی دا گشت بەشەکانی کوردستانی عێراق لەژێر ڕێبەرایەتی خۆیدا یەک بخات و وەک هەنگاوی یەکەم لەژێر سەرپەرشتی ئینگلیزدا بێت. سیاسەتی ئینگلیزیش لە پێشدا هانی ئەم ڕێبازەی دەدا بەڵام زۆری نەخایاند ئیدی نیازی بەریتانیا گۆڕا و پێش دامەزراندنی فەرمانڕەوایی خۆماڵی هاتە سەر ئەو ڕایەی کە ویلایەتی مووسڵی کۆن (واتا ناوچە کوردییەکە) بدرێتە دەم دەوڵەتی عێراقی نوێوە. بێگومان ئەم ڕاڕایی و گۆڕانەش لە سیاسەتی ئینگلیزدا کە بێ ئومێدی لای شێخ مەحموود و نیشتمانپەروەرانی کورد ئافراند بوو بەهۆی هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشانەی کە شێخ مەحموود لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠ و ١٩٤٠دا دژی حکوومەتی عێراق بەرپای کردن. شێخ مەحموود لە یەکێک لەو شۆڕشانەدا سەرکەوت و خۆی کرد بەپاشای کوردستان (ناوچەی سلێمانی) و ئەندامانی وەزارەت و کارمەندییشی بۆ خۆی دانا(٦٢). کوردانیش بۆ ئاسانکردنەوەی وەدیهێنانی ئاواتەکانی

خۆیان لە دەوری خڕبوونەوە[٦٣]. داخوازیی کوردەکانیش لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا کەم بووەوە تا وای لێ هات لە داواکردن بۆ بەکارهێنانی زمانی کوردی لە فێرگە و کارگێڕییە حکوومەتییەکاندا کە بۆ خۆی یەکێک بوو لە مافەکانیان کە کۆمەڵەی نەتەوەکان بڕیاری لەسەر دابوو و حکوومەتی عێراق لە کاتی خۆیدا دانی پێدا نابوو تێپەڕی نەدەکرد.

هەرچەندە حکوومەتی عێراق جاربەجار ئەوەی جەخت دەکردەوە کە بە ڕێزلێگرتنی ئەو مافە سەرەتاییانە خۆ دەبەستێتەوە بەڵام بەردەوام لە جێبەجێکردنیدا خۆی دەدزیەوە و هەر کوردێکیش داوای جێبەجێکردنی بکردایە بەجیاخواز تاوانباری دەکرد[٦٤].

کاتێک شۆڕشەکانی شێخ مەحموود لە ١٩٣٠دا بە دوورخستنەوەی شێخ مەحموود بۆ دەرەوەی ناوچەکەی خۆی کۆتایی هات، ئاگری شۆڕشێکی نوێ ئەمجارەیان لە ناوچەی بارزان هەڵگیرسا. شۆڕشەکانی بارزانیش بەگشتی ئەو تایبەتمەندێتییەیان تێدا بوو کە هۆکارەکانیان ناوچەیی بوون و هیچ جۆرە بیر و ئامانجێکی جوێبوونەوەشیان نەبوو

بێگومان حکوومەت توانستی ئەوەی هەبوو ناوچەکە لە نەهامەتی و وەی و کاولکردن و تێکدان و ڕووخاندن و لەنێوچوونی گیانیی بپارێزێ، ئەویش بەچارەسەری هۆی هەڵگیرسانی ئەو شۆڕشانە بەژیریی و وردبینی و بەلابردنی هۆیەکانی وەڕەزی و بێزاری.

یەکەم شۆڕشی دووەمی بارزان لە ساڵی ١٩٣١دا شێخ ئەحمەدی بارزان بەرپای کرد و هۆیەکەشی بڕێک ناڕەزایی و گازندەی ناوچەیی بوو. سوپای عێراق لە دەستپێکدا بەهۆی سەختیی دەڤەرەکەوە تووشی زیانێکی مەزن هات بەڵام هێزی هەوایی پاشایەتی بریتانی فریای کەوت و بۆ دامرکاندنەوەی ئەو شۆڕشە یارمەتی دا[٦٥].

ئاگری شۆڕشی دووەمی بارزان ساڵی ١٩٣٥ هەڵگیرسا و ئەم جارەش خەلیل خۆشەوی ڕێبەرایەتی کرد. هۆیەکانی ئەم شۆڕشەش وەک هۆیەکانی

شۆڕشی یەکەم بوون، بەڵام شێوەی چارەسەری لەلایەن حکوومەتی نێوەندەکییەوە لە شێوەی چارەسەری شۆڕشی یەکەم خراپتر بوو. دوای کوشتارێکی درێژخایەن هەردوو لا تووشی زیانێکی زۆری گیانی هاتن و هێزی هەوایی بریتانی نۆرەیەکی کاریگەرانەی تێدا بینی و بەهاریکاریی دەسەڵاتداریەتیی تورک سەرکردەکانی شۆڕشەکە گیران و بۆ دەرەوەی ناوچەکانی خۆیان دوورخرانەوە. توندوتیژترین و بەهێزترین شۆڕش لە بارزاندا ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٤٣دا بەڕێبەرایەتی مەلا مستەفای بارزانی هەڵگیرسا. ئەم شۆڕشە بەناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر ئەو مامەڵە و ڕەفتارە خراپەی کە حکوومەت بەرامبەر ئەو داخوازییانە و بەرامبەر سەرکردەکانیان ئەنجامی دەدا پەرەی سەند و بوو بە شۆڕشێکی نیشتمانپەروەرانەی فروان[٦٦]. ئەم شۆڕشە نێزیکەی دوو ساڵێک درێژەی هەبوو (واتا تا ساڵی ١٩٤٥) و هەردوو لا زیانێکی گیانی زۆریان لێ کەوت و بەکشانەوەی مەلا مستەفا و چەند سەد کەسێک لە پیاوەکانی بەسەر سنووری ئێران و دواییش بەسەر سنووری ڕووسیادا کۆتایی هات.

زۆر کەسان بەتایبەت لە ئەفسەرانی سوپا لەوانەی بەشداریی شۆڕشەکەیان کردبوو لە سێدارە دران و زۆریشیان بۆ دەرەوەی ناوچەکانی خۆیان دوورخرانەوە[٦٧]. بەو شێوەیە دەردەکەوێ کە زۆربەی هۆیە ڕاستەوخۆکانی شۆڕشەکانی کورد ناڕەزایی و گازندەی ناوچەیی بوون ئەگەرچی هەستی نیشتمانپەروەری نۆرەی کاریگەری لە بزواندنی سۆزدا دەدی. دوکتۆر مەجید خەددووری دەربارەی ڕوودانی ئەو شۆڕشانە و شێوەی بەرەوڕووبوونەوەیان لەلایەن حکوومەتەوە دەڵێ: «کورتبینیی حکوومەت لە چارەسەری کاروباری کورددا لەوەدا ڕەنگی دەدایەوە کە پەنای دەبردە بەر هێز و دوورخستنەوە یا دەم چەورکردنی سەرکردەکانیان.

بەو جۆرەش هەمیشە جەماوەری لە حاڵەتی ناڕەزاییدا بەڕەڵڵا دەکرد و بێگومان ئەم چارەسەرە دەرفەتێکی وای دەڕەخساند هەر ڕێبەرێکی سەرەڕۆ بۆ کوردانی تووڕە پەیدا ببێت ئیدی سەرلەنوێ ئەو شۆڕشانە سەرهەڵدەنەوە»[٦٨].

٣

# کوردستانی عێراق و کوردی عێراق

## جوگرافیای کوردستانی عێراق

کوردستانی عێراق بریتییه له چوار پارێزگه (لیوا): پارێزگەکانی مووسڵ، هەولێر، سلێمانی و کەرکووک هەروەها بەنێو پارێزگەی دیالەشدا درێژەی هەیە و ناوچەکانی خانەقین و مەندەلی دەگرێتەوە و ئەو پارێزگەیانەش بەشی باکوری ڕۆژهەلات پێک دێنن. لەبەرئەوەی کوردەکان گەلێکی چیاییین ئیدی لەو شوێنەی کە تێیدان لە هەر کوێیەکەوە دەشتایی دەست پێ دەکات ئەوان بۆ عارەبیان بەجێ هێشتووە. بەو جۆرە هەرچی دانیشتوانی دەشتاییەکانی پارێزگەی مووسڵ هەن گشتیان عارەبن و هەرچی بەشە دەشتاییەکەی کەرکووکیشە هەر وایە و لەوێ بەزۆری عارەب و تورک دەژین. لە ڕاستیدا سلێمانی و هەولێر تاکە دوو پارێزگەن کە پڕانیی دانیشتوانیان بەتەواوی کوردن وەک لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ:

| پارێزگە | ڕێژەی ٪ |
| --- | --- |
| سلێمانی | ١٠٠ |
| هەولێر | ٩١ |
| کەرکووک | ٥٥,٢ |
| مووسڵ | ٣٥ |

خشتەی ڕێژەی دانیشتوان لە پارێزگە کوردییەکاندا(٦٩)

دەتوانرێ بگوترێ ئەو ناوچە شاخاوی و نیوچە شاخاوییەی کوردی تێدا دەژی نێزیکەی ٧ ٪ی پانایی گشتی عێراقە، بەڵام لە هەمان کاتدا گرنگترین سەرچاوەی سامانی عێراقی تێدایە کە نەوتە. لەگەڵ ئەوەدا کە تێکڕای گشتی بەرزیی چیاکانی ئەم ناوچەیە لە پێنج هەزار پێ تێناپەڕێ، ژمارەیەکی زۆر لووتکە هەن لە هەشت هەزار پێ بەرزترن. ناوچە ڕک و هەڵەمووتەکانی ئەم چیایانە کە هێشا دەستی تێکدەری مرۆڤیان نەگەییشتوونێ بەدارستان داپۆشراون. بەڵام بەهۆی بەکاربردنی بەردەوام و سووتاندنی دارستان لە پێناوی بەکاربردنی خاکدا بۆ کشتوکاڵ زۆربەی چیاکان لە بەرگە ڕووەکییەکانیان ڕووت کراونەتەوە. ڕووباری دیجلە بەبەشی باکوری کوردستانی عێراقدا دەڕوا و گەلێک چەم و زێ کە بەناوچە کوردییەکەدا دەڕۆن وەک خابوور و زێی گەورە و زێی بچووک و چەمی عزێم و چەمی سیروان (دیالە) ی تێ دەڕژێن.

بەڵام ئاووهەوای کوردستانی عێراق لە هاویندا نێوەنجییە و لە زستاندا زۆر ساردە. لە وەرزی زستان و هاوینیشدا دوندگەلێکی زۆری کەژە بەرزەکان بەفر دایاندەپۆشێ.

بەم کورتە باسکردنە گرنگیی ئەم ناوچەیە بۆ بەشە عارەبییەکەی عێراق دەردەکەوێ. بەهۆی بوونی کان و سەرچاوەی ئاوەوە کە لەم ناوچەیەدا هەن ناوچەکە گرنگییەکی ئابووریی هەیە. بەشە زۆرەکەی نەوتی عێراق لە خاکی کوردەوە هەڵدەقوڵێ و بەشە زۆرەکەی ئەو ئاوانەیش کە دەڕژێنە ڕووباری دیجلەوە لە چیاکانی ئەم ناوچەیەوە هەڵدەقوڵێن. هەر بۆیەش گرنگترین بەستەی ئاو لە کوردستانی عێراقدا دروست کراوە. لەلایەکی دیکەشەوە جوانیی ناوچەکە و هاوینی فێنکی وای لێ دەکات ببێتە باشترین هاوینەهەواری دانیشتوانی ناوچە دەشتاییە عارەبییە هاوسێیەکە کە هاوینێکی گەرمی هەیە. بەهۆی هەڵەمووتیی چیاکانیشیەوە دەڤەرە کوردییەکە لە ڕووی سەربازییەوە گرنگییەکی زێتری هەیە و بووە بەسەنگەرێکی قاییم بۆ پارێزگاریکردن لە ناوچەکانی نێوەڕاست و باشوور.

## سامانی کشتوکاڵ

هەرچەندە کوردستانی عێراق خاکەکەی شاخاوییە، بەڵام چیاکانی پاناوکن و دەشتاییگەلێکیان لە نێوان خۆیاندا حەشار داوە کە بەهۆی پیت و تۆقی خاکەکەیانەوە و بەکاربردنی سروشتییەوە (نەمانەوە و پەنگ نەخواردنەوەی ئاو و ڕۆیشتنی بەئاسانی بەهۆی لێژیی خاکەوە- وەرگێڕ) بۆ کشتوکاڵ باشن. پانایی زەوییە بەکەڵکەکان بۆ کشتوکاڵ لە پارێزگە کوردییەکاندا بەم شێوەیەی خوارەوە خەملێندراوە:

| پارێزگە | پانایی گشتیی زەویی کشتوکاڵی بەکم٢ | زەویی چێنراو بەکم٢ | ڕێژەی زەویی چێنراو لەگەڵ پانایی گشتیدا ٪ |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٩٥٥٢ | ٣٥٥١ | ٣٧ |
| هەولێر | ١٨١٧٠ | ٤٥٥٧ | ٢٥ |
| کەرکووک | ٣٠٣٧٦ | ٥٧٤٣ | ٢٨ |
| مووسڵ | ٢٩٧٧٠ | ٢٩٠٥٨ | ٥٣ |

خشتەی پانایی زەویی کشتوکاڵی و زەوییە چێندراوەکان لە پارێزگە کوردییەکاندا(٧٠)

بەم خشتەیەدا دەردەکەوێ کە پانایی زەویی چێندراو لە ڕاستیدا هێندەی تەواوی پانایی زەویی بەکەڵکی کشتوکاڵ هاتوو نییە. زەوی بەکەڵکی کشتوکاڵ هاتوو لە هەولێر بە ٧١٦٠کم٢ و لە کەرکووک بە ١٥٢٦٠کم٢ و لە مووسڵ بە ٢٩٧٧٠کم٢ خەملێندراوە(٧١).

ئەو بەرهەمە کشتوکاڵیانەی ناوچە کوردییەکە لە ئابووریی عێراقدا بەشدارییان پێ دەکات دوو جۆرن: زستانە و هاوینە. بەروبوومە زستانییەکان گەنم و جۆن و پارێزگە کوردییەکان بەم شێوەیەی خوارەوە بەشداریی تێدا دەکەن:

| پارێزگە | گەنم (تۆن) | جۆ (تۆن) |
| --- | --- | --- |
| سلێمانی | ٧٠٠٠ | ٧٠٠٠ |
| هەولێر | ١٠٤٠٠ | ٦١٠٠٠ |
| کەرکووک | ١٠٩٠٠٠ | ١٥٦٠٠٠ |
| مووسڵ | ٢٢٢٠٠٠ | ١٧٨٠٠٠ |
| سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق | ٤٧٩٠٠٠٠ | ١١١١٠٠٠ |

خشتەی بەرهەمی گەنم و جۆی پارێزگە کوردییەکان لە ساڵی ١٩٥٤دا(٧٢)

ناوچە کوردییەکە لە شینایی هاوینەدا بەتایبەت لە بەرهەمهێنانی تووتندا پتر بەشداری دەکات تا لە بەروبوومی زستانەدا. لە ڕاستیدا تووتن شابەرهەمی ناوچە کوردییەکەیە و تا ڕادەیەکیش چاندنی تووتن هەر لە باکوردا دەکرێت. پاش تووتن گرنگی بەبرنج و لۆکە دەدرێ. ئەم خشتەیەی خوارەوە بەشداریکردنی ناوچە کوردییەکە لە شینایی هاوینەی سەرەکیدا پیشان دەدات:

| پارێزگە | تووتن (تۆن) | لۆکە (تۆن) | برنج (تۆن) |
| --- | --- | --- | --- |
| سلێمانی | ٢٥٠١٣ | ٨٣٠٣ | ٧٩٥٤ |
| هەولێر | ١١٠١٣ | ٣١٦٥ | ٣٨٤٣ |
| کەرکووک | ٦٨٢ | ٧٥٠ | ٩٦٥٦ |
| مووسڵ | ٢٢٧٤ | ٦٧٢٤ | ١٠٢١١ |
| سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق | ٤٠٠٦٤ | ٩٦٢٩٢ | ٥١٤٩٢٢ |

خشتەی بەشینەوەی شینایی هاوینە لە ناوچە کوردییەکەدا لە ساڵی ١٩٥٣دا(٧٣)

ناوچە کوردییەکە لە وەبەرهەمهێنانی میوەشدا بەهەموو جۆرەکانییەوە بەشدارییەکی زۆر دەکات و لەم خشتەیەی خوارەوەدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە:

| پارێزگە | هەنار | قۆخ | سێو | هەڵووژە | زەردەڵوو |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| سلێمانی | ١٦٨٨٤٢ | ٤٠٣٢٩ | ٢٠٩٠٣ | ١٩٠٦٣ | ١١٤٣٧ |
| هەولێر | ٦٦٢٠٠ | ١١١٠١ | ١٤١٠١ | ٧٣٥١ | ١٦٦٤ |
| کەرکووک | ١٦٧٦٩ | ١٣٠٣ | ٥٨٢٨ | ٣٤١٩ | ٧٦٠٢ |
| مووسڵ | ٨٦١٧٦ | ٨٠٥٤ | ٣٠٧٦٥ | ٢٦٧٨١ | ٢٥٢٤٨ |
| سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق | ٢٠٦٠٢٤٩ | ١٠٣٢١٣ | ٧٦٣٩٨١ | ١٧٨٠٩٠ | ٥٦٦٠٩١ |

خشتەی بەشینەوەی داری میوە لە پارێزگە کوردییەکاندا لە ساڵی ١٩٥٣دا[٧٤]

بەشداریکردنی ناوچە کوردییەکە لە بەرهەمهێنانی مزرەمیوەی وەک پرتەقاڵ و لیمۆ کەمە و ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەگونجانی ئاووهەوای ساردی ئەم ناوچەیە بۆ ڕواندن و بەرهەمهێنانی ئەم میوانە. بەڵام پارێزگە کوردییەکان بەشدارییەکی زۆر لە وەبەرهێنانی میوەدا دەکەن و خۆیشیان بەتەنێ گوێز و پستە و باهیڤەڕووەکی دیکەی وەک ئەوان دەڕوێنن.

میوەی ناوچە کوردییەکە گرنگییەکی بازرگانی تایبەتی هەیە چونکە ڕەسینی دەکەوێتە دوای ڕەسینی میوەی نێوەڕاست و خوارووی عێراق لەبەر ئەوە لەکاتێکدا دادەبەزێتە بازاڕ کە میوەی بەرهەمهێنراوی ناوچەکانی دیکەی عێراق لە بازاڕدا کەمە.

ئەگەر ڕەنێوهێنانی ئەو بەروبوومە کشتوکاڵییانەی کە باسکران لەگەڵ ڕەنێوهێنانی دەوڵەتانی پێشکەوتوودا بەراورد بکرێن کەمیی ئەوانەی باسکراو دەردەکەوێ. هۆی ئەوەش تەنێ هەژاریی وەرزێر نییە بەڵکە دەگەڕێتەوە بۆ نەزانینی لایەنە تەکنیکییەکانی کشتوکات و خراپیی ئەو ئامێر و ئامرازانەی کە لە کاری وەرزێریدا بەکاریان دەبات. وەرزێری عێراقی بەگشتی- چ کورد بێ یا عارەب- نازانێ چۆن ئاو بەکاربێنێ و

زۆرجاران لە ترسی ئەوەی کە نەبادا لە کاتی پێویستدا دەستی نەکەوێ هەر بەبێ هۆ ئاوێکی زۆر بەکار دەبات. لە هەمان کاتیشدا هەر ئەو شێوە کۆنەیەی کاری کشتوکاڵ کە لە باپیرانییەوە بۆی بەجێ ماوە پەیڕەو دەکات و ئاگاییییەکیشی لە بارەی خولی کشتوکاڵیشەوە- کە بەگوێرەی ئەوە وەرزێر چەند جۆرێکی جیاوازی بەروبووم بەنۆرە دەچێنێ بۆ ئەوەی پیتی زەوییەکە بپارێزێت- نییە. ئەگەر وەرزێر خولی کشتوکاڵیش بزانێت ڕێگرە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان- کە بەپلەی یەکەم ئەنجامی یاسای موڵکداریەتیی زەوی و زار و یاسای ئاودێرین- ڕێگەی جێبەجێکردنی لێ دەگرن. لە کاتێکدا کە شێوەی بەیار بە بەیار کێڵانی زەوی بەم جۆرەی کە ئێستا جێبەجێ دەکرێ بەشی گێڕانەوەی پیت بۆ زەوی ناکات، وەرزێر بۆ گێڕانەوەی تۆق بۆ زەویی بەکاربراو و ماندوو بەدەگمەن پەیینی سروشتی یا دەستکرد بەکار دێنێ. کەم جاریش وەرزێر بۆ پاراستنی زەوی پەنا دەباتە بەر شێوەی کەنتۆری کشتوکاڵ (شێوەی چاندن و درەختاندنی پێپلکەئاسا کە بەلاپاڵی چیاکەدا هێڵی جادەئاسا لەسەر یەک ئامادە دەکرێ و دەچێندرێ و دەدرەختێندرێ وەک ئەوەی کە لە ناوچەی هەورامان و بادیناندا پەیڕەو دەکرێ- وەرگێڕ) ولێڕاندن و پاراستنی دارستانگەلێک کە هەن.

هەرچی ئامێرگەلێکیشە کە وەرزێر بەکاریان دەبات کۆن و سستن و ئاژەڵی ناساغ و شەکەت ڕایاندەکێشن و گاسنەکەی هەر بە ئاستەم زەوییەکە دەڕووشێنێ و داس و ئامێری گێرەکەی کاتێکی زۆریان دەوێ و ئەنجامی باشیش نادەنە دەستەوە. وەرزێر بۆ ئەوەی داهاتێکی زۆری دەستکەوێ دەبێ شێوەی زانستیی کشتوکاڵ فێربێت و دەبێ ئەم ئامێرە کشتوکاڵیانەی ئێستای بگۆڕێ بەئامێری میکانیکی نوێ، کە ئەوەش بێگومان بەواتای بەکارهێنانی تواکتۆر و کۆمباین نییە. ئامێرە گچکەکان کە بەشێوەی نوێ دروست دەکرێن و ئاژەڵی بەهێز ڕایاندەکێشن لەم کاتەدا جێی ئامێری گەورە دەگرنەوە کە پێویستییان بەسەرمایەی قەبە و خەرجی

زۆر هەیە. بەهەرحاڵ ئەم بیرازە تەکنیکییانە بەبێ هاریکاریی ماددی و مەعنەوی لە نێوان حکوومەت و وەرزێردا و بەبێ چاککردنی یاسای موڵکداریەتیی زەوی کە ئێستا لە وڵاتدا هەیە، ناکرێت. هەرچی زەوی و زاری کشتوکاڵییە لەناوچە کوردییەکەدا ئەویش وەک یاسای ناوچە عارەبییەکەیە کە یاسای موڵکداریەتیی فرەوانە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕەوشی کوردستان لە ناوچە عارەبییەکان باشترە. ئەم خشتەیەی خوارەوە وێنەیەک لەمەڕ ڕەوشی موڵکداریەتیی کشتوکاڵی لە ناوچە کوردییەکەدا پیشان دەدات:

| پارێزگە | پانایی زەوی موڵک بە کم٢ | ژمارەی موڵکەکان | تێکڕای قەبارەی موڵکەکان بە هێکتار |
|---|---|---|---|
| سلێمانی | ٢٦٨٥ | ١٧٦٢٨ | ١٥ |
| هەولێر | ٤٩٩٥ | ١٥١٩٩ | ٣٣ |
| کەرکووک | ٨٥٦٢ | ٧٤٠٩ | ١١٦ |
| مووسڵ | ١٠٦٦ | ٣١٥٣٢ | ٣٢ |

خشتەیەک ڕەوشی موڵکداریەتیی کشتوکاڵی لە پارێزگە کوردییەکاندا پیشان دەدات(٧٥)

لەگەڵ ئەوەشدا کە یاسای موڵکداریەتی کشتوکاڵی لە هەردوو ناوچە عارەبی و کوردییەکەدا وێک دەچن هێشتا وەرزێری کورد بەگشتی لە وەرزێری عارەب جێگرتووترە و زێتر بەندە بەزەوییەوە و لە زۆربەی باریشدا وەرزێری کورد زەوییەکی دیاریکراوی لە باوک و باپیرانەوە بۆ دەمێنێتەوە کە کشتوکاڵی تێدا بکات و خاوەن موڵکیش ناتوانێ لەو زەوییە وەدەری نێ، بەو جۆرەش خانووداری و نیشتەجێبوون لە ناوچە کوردییەکدا لە شێوەی گونددایە کە جێگیر و چەسپاوە. هەرچی وەرزێری عارەبیشە مافی ئەوەی نییە زەوییەکی دەستنیشانکراوی هەبێت، کە هەموو ساڵێک بتوانێ کشتوکاڵی تێدا بکات، لەبەر ئەوەش ژیانی ئەو باری

ناسەقامگیری باڵی بەسەردا کێشاوە و بەردەوام لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی لە گواستنەوەدایە. هەر بۆیە ماڵەکەشی ساکارە و بەئاسانی تێکدەدرێ و لە ڕواڵەتدا بریتییە لە زنجێک کە بەدارە خورما و لەبان دروست کراوە.

جۆری خانووداری و نیشتەجێیی باو لە لادێی ناوچە عارەبییەکەدا لە شێوەی کۆمەڵدایە کە دەکاتە گەڕۆکە گوند نەک گوندی نیشتەجێ و چەسپاو. جیاوازییەکی دیکە لە نێوان ناوچە کوردییەکە و ناوچە عارەبییەکەدا کە هەیە شێوەی بەشینەوەی داهاتی کشتوکاڵییە لە نێوان وەرزێر و خاوەن موڵکدا. بەگوێرەی شێوەی بەشینەوەی بەرهەم لە نێوان وەرزێری کورد و خاوەن موڵکدا بەشی خاوەن موڵک لە نیوەی هاوینەبەرهەم (بەتایبەت توتن و لۆکە) و دەیەکی داهاتی زستانەیە بەرهەم (کە دەیمەکاڵە) کە بەشێوەیەکی گشتی دانەوێڵەیە، تێناپەڕێ. بەڵام بەشی وەرزێری عارەب لەو زەوییانەدا کە ئاودێری دەکرێن و تەڕکاڵن ٣/٥ یا ٢/٣ یە ئەگەر خاوەن موڵک بەتۆو بەشداری بکات و لەو زەوییانەشدا کە بەئامراز (مەکینە و ماتۆر) ئاودێری دەکرێن ٢/٥یە[٧٦]. بەڵام ئەم بەشە لە ڕاستیدا زۆر کەم دەبێتەوە چونکە باجی سەرکار (٧,٥٪) و باجی حکوومەت (١٠٪) و بەشی قاوەچی و دیوەخان و مەلا و میراوی لێ دەبردرێ.

وەرزێری کورد لە چاندنی زەوییەکەیدا تووشی سەختییەکی زۆر دەبێت و بەرپرسی یەکەمیش لەوەدا یاسای موڵکداریەتیی زەوی و زاری کشتوکاڵییە. موڵکداری کورد بەگشتی لە بارەی کاروباری زەوییەکەی خۆیەوە تا ڕادەیەک هیچ نازانێت و بەسەرمایەش بەشداریی بەرهەمهێنانی زەوی ناکات و هەموو تێچوون و ئەرک و بەرپرسیارییەکیش دەکەوێتە ئەستۆی وەرزێری کورد. وەرزێری کورد لەبەرئەوەی هەمووده‌م لە وەرزێری عارەب زێتر مەترسیی ئەوەی هەیە تووشی لێقەومانی سروشتی بێت، بەردەوام پێویستی بەپارە و تۆو هەیە و

قەرزدارە. ڕەنگە سەرسەخترین و خەتەرناکترین دوژمنی وەرزێری کورد وشکەساڵی و کەم بارانی بێت.

کشتوکاڵی زستانە لە زۆربەی ناوچەکاندا بەستراوە بەبارانەوە. ئەگەر هات و باران دواکەوت یا پێش کاتی خۆی کەوت یا کەم باری ئەوە دەبێتە هۆی برسی بوونی وەرزێری کورد، چونکە ئەوە مانای تیاچوون و زیان پێکەوتنی تۆوەکەیەتی و ئەوە دەگەیەنێ کە لە بری هیچ جۆرە بەرهەمێک بۆ بەکاربردن یا فرۆشتن یا چاندنی لە ساڵی داهاتوودا قەرەبوو ناکرێت. کشتوکاڵی هاوینەش بەشێوەیەکی سەرەکی پشت بەکانیاوەکان دەبەستێت. ئاوی کانیاوەکانیش بەپلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ چەندێتیی بارانی زستان و چەندێتیی بەفری کۆوەبووی سەر ترۆپکی چیاکان. ئەگەر زستانێکی کەم باران و نیوەگەرم بەسەردا بێت ئاوی کانیاوەکان کەم دەبێ و وشک دەکەن و کشتوکاڵی هاوینەش دەفەوتی:

دووەم دوژمنی وەرزێری کورد مێرووە بەتایبەت کوللە و سن و کرمی پەموو کە هەموو ساڵێک کشتوکاڵ خراپ دەکەن و تێک دەدەن. هەندێک ساڵ کوللە تەواوی بەرهەمەکە دەخوات و سنیش پتر لە نیوەی بەرهەمەکە تێک دەدات. قەڵاچۆکردنی ئەم مێروووانەش زۆرجاران بەشێوەیەکی نازانستییانە دەکرێ بۆیە زیانیان ساڵانە دووبارە دەبێتەوە.

ئەگەر سروشت بەهۆی نەمانەوە و پەنگنەخواردن و ئاسان ڕۆیشتنی ئاوەوە بەهۆی لێژیی خاکەکەوە لە زەوییە چیاییەکاندا وای کردووە کە وەرزێری کورد لە زیانی شۆڕەکاتیی زەوی و زەنەکاو، کە گیروگرفتی یەکەمی وەرزێری عارەبە، بەدوور بێ، ئەوا گیروگرفتێکی لەوە گەورەتری هەیە، ئەویش گیروگرفتی داشۆرانی زەوییە. ئەم گیروگرفتە کارێکی وا دەکات کە زەویی کشتوکاڵی دەکات بەزەوییەکی بەردەڵانی ڕەقەن کە تەنێ خۆڵێکی کەم دایپۆشیبێ. داشۆرانی زەویش دەرەنجامی نەڕواندنی دارە لە هەوراز و لاپاڵی کەژەکاندا بۆ ئامادەکردنی بەربەستێک بۆ ڕێگەگرتن لە لافاوی بەتەوژمی بەرزایی شاخەکان، هەروەها بەهۆی پەیڕەو نەکردنی

دەستاوێژ و شێوەی زانستی لە کێڵانی زەوییە لێژگەکاندا بەشێوەی پێپلکەی (کەنتوری) داشۆران ڕوو دەدا. ئاشکراشە کە گڵی کەم و تەنک بەهۆی کەمیی خۆراکی ڕووەکەوە دەبێتە هۆی لاوازیی بەرهەم.

کەواتە وەرزێری کورد گیروگرفتێکی زۆری هەیە کە لە دواییدا دەبنە هۆی لاوازیی توانستی بەرهەمهێنانی و نزمیی ئاستی ژیانی. ئاشکراشە ئەم ئاکامە تەنیا زیان بەلایەنی مرۆڤایەتی ناگەیەنێ، بەڵکە لە ڕێگەی کەمیی چەندێتی و ئاستی بەرهەمهێنانەوە زیان لە سامانی نیشتمانی دەدا و داهاتی نیشتمانیش کەم دەکاتەوە. بۆ چارەسەری ئەم گیروگرفتانەش دەبێ لەسەر ڕا دەست پێ بکەین واتە دەبێ گیروگرفتی موڵکایەتیی کشتوکاڵی چارەسەر بکەین، ئەویش بەوەی کە موڵکداریەتیی پارچە زەوییەک کە لە ڕووی پانایییەوە هۆشگیر بێت و لەگەڵ توانستی بەرهەمهێنان و جۆری زەوییەکە و شێوەی بەخێوکردنیدا بگونجێ، بدرێ بەوەرزێر. بەڵام ئەمە چارەسەرێکی تەواو نییە ئەگەر بێت و کۆمەڵە کارێکی دیکە نەکرێن، وەک قەرزدان بەوەرزێر بەسوودێکی کەم و مسۆگەرکردنی تۆوی پێویست و هاندانی کۆمەڵە هەرەوەزییەکان، کە هاسان کردنەوەی کڕینی تۆو بۆ وەرزێر دەگرنە ئەستۆی خۆ لە تەک بەکرێگرتنی مەکینەی ئاسان بەکاربەر و دەستەبەرکردنی عەمباری پێویست بۆ هەڵگرتنی دانەوێڵەی زیاد، هەروەها کارکردن بۆ بەشینەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی. دەبێ کێڵگەی تاقیکردنەوە و پێنوێنیکاریی کشتوکاڵی بەشێوەی پراکتیکی و بەسوود بۆ بارهێنان و فێرکردنی وەرزێر- لە مەڕ چۆنیەتیی پاراستنی گڵ و بەکاربردنی ئاو و پەیڕەوکردنی خولی کشتوکاڵی و بەجێهێنانی چاندنی تێکەڵ و بەکاربردنی پەیین و قەڵاچۆکردنی مێروو و تا دەگاتە دوا ڕێگە و شێوەگەلێک بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمی کشتوکاڵ- دەستەبەر بکرێت بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ماددیی وەرزێریش- کە یەکجار نزمە- دەبێ تۆڕێکی ڕێگەی هاتوچۆ چی، بکرێ بەتایبەت لارێ لە نێوان گوند و کێڵگەکاندا، چونکە بەبێ تۆڕی ڕێگەوبان

گواستنەوەی بەرووبوومی کشتوکاڵ بۆ ئەوەی بخرێتە بەر دەست زۆرترین ژمارەی کڕیار ناکرێت و ئەگەر ئەو کارەش نەکرێت، ئەوا ئەو بەرهەمانە خراپ دەبن یا نرخیان بەیەکجاری دێتە خوارێ. هەروەها دەبێ چاککردنی باری ژیانی وەرزێران تەنێ لایەنی مادی نەگرێتەوە، بەڵکە دەبێ لایەنە کۆمەڵایەتییەکانیش کە باری فەرهەنگی و لەشساغی و گشتی دەگرنەوە چاک بکرێن. چاککردنی ئەو لایانانە لە ڕاستیدا پێکەوە گرێدراون، گریدانێکی زۆر بەهێز. بیرازی ئابووری ئەگەر بیرازی کۆمەڵایەتیی لە تەکدا نەبێت ئەنجامێکی باشی نابێت. بیرازی ئابوورییش بەرهەمی تەواوی خۆی نادات لە کاتێکدا کە وەرزێر لە ژێر کارتێکردنی نەریتی کۆمەڵایەتیی کۆندا بێت و بەکۆتی زەبوونی و کۆیلایەتی و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و تەمبەڵی و درۆ کە پاشماوەیەکی بۆگەنی چەند پشتێکن بەسترابێتەوە. کەوا بوو دەبێ لە ڕێگەی فەرهەنگ و ڕێنوێنیکردنەوە نرخی وەرزێر وەک مرۆڤ بگێڕدرێتەوە - بۆ ئەوەی ببێتە مرۆڤێکی دەروون ئازاد و شانازی بەسەربەرزیی خۆیەوە بکات و بەتەنگ خێزانییەوە بێت و هێندەی بەتەنگەوەهاتنی بەرژەوەندی خۆی ڕێزی بەرژەوەندی خەڵکی دیکەش بگرێت- بۆ ئەوەی بیرازی ئابووری و بیرازی کۆمەڵایەتی هاوشان لە تەک یەکتردا بڕۆن و لە دواییدا ببنە هۆی دروستکردنی هاوولاتیی باش کە ماف و ئەرکەکانی خۆی بزانێت و کارەکانیشی زۆر بەباشی بکات.

## ئاژەڵداری

ناوچە کوردییەکە لە سامانی ئاژەڵی ولاتیشدا بەشدارییەکی گەورە دەکات و ڕەنگە ئەم بەشداریکردنەشی لە بەشداریکردنی لە سامانی کشتوکاڵیدا زیتر بێت. بێجگە لە کوردانی ڕەوەند کە پیشەیان ئاژەڵ بەخێوکردنە، وەرزێری کوردیش لە وەرزێری عارەب پتر گرنگی بەئاژەڵ بەخێوکردن دەدا. هەرچەندە بەخێوکردنی ئاژەڵ لە هەردوو ناوچە کوردی و عارەبییەکەدا لەسەر بنەمای کشتوکاڵی تێکەڵ- واتە بەکارهێنانی پیسایی ئاژەڵ بۆ پەیینکردنی زەوی و بەکاربردنی ئاژەڵ بۆ بەرهەمهێنانی

شیرەمەنی- بەڕێوە ناچێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا وەرزێری کورد گرنگییەکی تایبەت دەدا بەوەی کە بەگوێرەی توانستی ئابووریی خۆی چەند سەرێک ئاژەڵی هەبێت. ڕەنگە ئەم سووربوون و بەتەنگەوە هاتنەیشی بگەڕێتەوە بۆ ئەو پەندانەی کە سروشت فێری کردوون ئەویش بەوەی کە ڕەنگە بەهۆی بێ بارانی و مێرووەوە لێقەومانێک وەپێش بێت و کە چۆن گەرەکە پشت بەسەرچاوەیەکی دیکەیش ببەستێ. وەرزێری کورد ڕێچاڵی ئاژەڵەکانی بۆ خۆراکی خۆی و ئاژەڵیش بۆ جۆت و گواستنەوە بەکار دەبات. وەک بەڵگەیەکی بەشداریکردنی ناوچە کوردییەکە لە سامانی ئاژەڵدا ئەم خشتەیەی خوارەوە هەندێ شتمان بۆ ڕوون دەکاتەوە:

| ئاژەڵ | پارێزگە | | | | سەرجەمی گشتی بەرهەمی عێراق |
|---|---|---|---|---|---|
| | سلێمانی | هەولێر | کەرکووک | مووسڵ | |
| بزن | ٣٤٧٢٧٤ | ١٤٠٣٨٨ | ٢٦٣٠٣٢ | ٤٨٣٥٤٤ | ١٦١٨١٤٥ |
| مەڕ | ٢٣٣٦٦٤ | ١٦٩١٠٦ | ٥٢٢١٦٤ | ٧٤٩٩٧٨ | ٤٤٨٤١٥٦ |
| ڕەشەوڵاخ (مانگا و گا) | ٨٨١١٦ | ٣٠٠٦٥ | ٤٥٠٠٥ | ٦٣٦٦٩ | ٧١١٩١٨ |
| کەر | ١٨٥٨٦ | ٢٢٣٧٥ | ٣٢٤٩٥ | ٥٧٣٤٨ | ٣٩٨٧٩٨ |
| چارەوێ (ئەسپ و ماین) | ٣٥٣٧ | ٣٣٤٧ | ٣٨٨٣ | ١١٥٢٢ | ١٣٧٤٤٦ |
| هێستر | ٣٠٢٥ | ٨٢٤٣ | ٩٤٠٠ | ٣١٦٦٦ | ٥٦٦٧٣ |
| گامێش | ٤١٢ | ٦٨٨ | ٩٤٣ | ٢٢٤٤ | ٤٧٣٩٥ |
| وشتر | ١٣٩ | ١٠١ | ٩٤٠٠ | ١٦١٩٥ | ٣٧٦٩٦ |

خشتەیەک کە ئاژەڵی وەرزێری گوندە کشتوکاڵییەکان لە پارێزگە کوردییەکاندا (بێجگە لە ئاژەڵی ڕەوەندەکان) پیشان دەدات[٧٧].

خشتەی پێشوو بەڕوونی گرنگیی بەشداریکردنی ناوچە کوردییەکە لە ئاژەڵداریدا، بەتایبەت لە بزن و مەڕ و ڕەشەوڵاخدا، پێشان دەدات. بەڵام ئەم سامانە ئاژەڵییەش وەک سامانی کشتوکاڵی گیرۆدەی چەندین گیروگرفتە. ئاژەڵی کورد بەگشتی ناساغ و لەڕ و لاوازن و تێکڕای ڕێژەی مردن لە نێویاندا زۆر بەرزە و ڕەنگە هەندێ جار بگاتە ٥٠٪ [٧٨] ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە هۆکارێک گرنگەکەشیان بایەخ نەدانە بە ئاژەڵ لە هەموو ڕوویەکەوە وەک جێگە و لەوەڕگە و لەشساغیی گشتی. پشتیر و تەویلە و گەوڕی ئاژەڵان هیچ جۆرە مەرجێکی لەشسازیی تێدا نییە. ئاغڵ و پشتیر و گەوڕەکان بریتین لە چەند ژوورێکی تەنگ و تاریک و زۆر گەرم و یەکجار پیس، بۆیە ئەو پشتیرانە یاریدەی بڵاوبوونەوەی میکرۆب و نەخۆشی دەدەن و دەبنە هۆی ئەوەی ئاژەڵ تووشی سی ئاوسان بێن. هەرچی لەوەڕگەکانیشە تا ڕادەیەک زۆربەی کاتی ساڵ وشکن و بەشێوەیەکی ئاسایی ئاژەڵ لە پاشماوەی پاش درەوی دانەوێڵە دەلەوەڕێ. هەرچەندە لەوەڕگەکانی ناوچەی باکور لە لەوەڕگەکانی ناوچەی باشوور لەوەڕیان زۆرترە، بەڵام ئەوەشدا و بەتایبەتی لە وەرزی زستاندا بەشی خۆراکی ئاژەڵ ناکەن. بۆیە بڕێک لە ئەرکەکانی حکوومەت، بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئاژەڵداری، هاندانی چاندنی لەوەڕگەیە بەشێوەی زانستی و پاراستنی لەوەڕگەکانە کە هەن لە لەنێوچوون. دەستەبەرکردنی ئالیک و خۆراکی پێویست بۆ ئاژەڵ لە هاوین و زستاندا یەکێکە لە گرنگترین هۆکارگەلێک کە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی لەشساغیی ئاژەڵ.

لەبەر کەمیی ئامرازی تیمارکردنی وەک ئەستێڵکی لە ئاو هەڵکێشان و کەمیی دوکتۆری ئاژەڵ (بەیتاڵ) و نەبوونی فەرهەنگێکی لەشساغیی تایبەت بە ئاژەڵ، هەرچی چاودێریکردنی لەش سازیی ئاژەڵە تا ڕادەیەک نییە. بۆیە دەکرێ بگوترێ بەشینەوەی بنکەی تیمارکردنی ئاژەڵان بەسەر گوند و ئاوایییەکاندا بەشێوەی پێویست گرنگترین هۆکارە کە ڕێگەی

تەشەنەکردنی درم و نەخۆشی لەنێو ئاژەڵدا دەگرێ. کۆمیتەی بانکی ئاوەدانکردنەوەی نێودەوڵەتی بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئاژەڵداری لە عێراقدا ئەم کارانەی خوارەوەی وەک پێشنیاز دا بەحکوومەتی عێراق بۆ جێبەجێکردنیان:

١- دەستەبەرکردنی ژمارەی پێویست لە پسپۆڕ و دوکتۆری تیمارکەری ئاژەڵ و کارمەندی مەشقکردوو لەسەر بەخێوکردنی ئاژەڵ و شێوەی قەلاچۆکردنی نەخۆشی.

٢- چاککردن و دەستەبەرکردنی ئەستێلکی لەئاو هەلژەندنی ئاژەڵ بەشێوەی پێویست و دامەزراندنی ئەزموونگەی پێویست لە هەموو پارێزگەکاندا بۆ دۆزینەوەی نەخۆشییەکانی ئاژەڵ بەخێرایی لە ناوچەی مەبەستدا.

٣- دەستەبەرکردنی چارەسەری سیستماتیک و پارێزەر دژی میکرۆب و کرمی ناوەکی و قەلاچۆکردنی میکرۆبی دەرەکی بە لەئاوهەلکێشانی ڕەشەوڵاخ و پەز[٧٩].

هەروەها کۆمیتەکە ئەوەی جەخت کردووە کە ئاژەڵ سەرباری ئەو کارانە پێویستییان بەچاککردن هەیە لەگەڵ ئاژەڵی دیکەدا کە ساغترن.

هەرچی ئاژەڵی خێڵە کۆچەرەکانە کەمیی ئاو و کۆچی دوورودرێژ کە دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن لە نێویاندا، کاریان دەکەنە سەر. لەبەرئەوە دەبێ لەسەر ئەو ڕێیانەی خێڵە کۆچەرەکان دەیگرنە بەر، بۆ خۆپاراستن لە گەرمیی خۆر پەناگە دروست بکرێت و بۆ دەستەبەرکردنی پێویستییەکانی مرۆڤ و ئاژەڵیش، لە هەمان کاتدا دەبێ بیری ئاو هەلکەندرێ.

## سامانی کانزا و پیشەسازی

سامانی کانزا لە ناوچە کوردییەکەدا بەزۆری لە بوونی نەوتدا خۆ دەنوێنێ. پشکنینە سەرەتاییەکان ئەوەیان سەلماندووە ناوچە کوردییەکە ئاسن و زێڕ و مس و ڕەژووی بەردی تێدایە، بەڵام هەموو ئەم کانزایانە بایەخی ئابووریيان نییە چونکە نرخی تێچوونی دەرهێنانی چ لە ڕووی چۆنیەتی و چ لە ڕووی چەندێتیشەوە ئابوورییانە نییە. هەرچی بەردی مەرمەڕ و بەردە قسڵەکانی دیکەن ئێستاکە بەشێوەیەکی فرەوان لە دروستکردنی کەرەستەی بینادا بەتایبەت چیمەنتۆ بەکار دەبرێن. بۆ دەرهێنانی چیمەنتۆ لە پارێزگەی سلێمانی کارگەیەک دامەزراوە و ئومێدیش هەیە لەم جۆرە پیشەسازییانە لە داهاتوودا زۆربن.

ئەو پیشەسازییانەی ئێستا لە کوردستاندا هەن- ئەوانیش وەک ئەوانەی ناوچە عارەبییەکە- پیشەسازیی سەرەتایی و ناوچەیین و لە دروستکردنی کەرەستەی خۆماڵیی نێوماڵ و چنینی کوتاڵ کە پۆشاکی خۆماڵیی کوردیی لێ دروست دەکرێ، تێناپەڕن. لە نێو گوندە کوردییەکانیشدا دروستکردنی ڕایەخ و ژێرەخەر زۆر باوە. ناوچە کوردییەکە بۆ دامەزراندنی پیشەسازیی جگەرە و ڕستن و شەکر و ئامرازی دارین و کاغەز و هەروەها گشت جۆرە پیشەسازییەک کە لە بەرهەمەکانی نەوت سوود وەردەگرن لە بارە. بۆیە دەبێ پیشەسازییە فرەوانەکان کە بەرهەمی ناوچەکە بەکاردەبەن بەتایبەت بەرهەمی کشتوکاڵی، هان بدرێن.

کوردەکان ئەوەیان سەلماند کە دەتوانن کارە هونەرییەکان بە باشی و بەخێرایی فێربن و بەماوەیەکی کەم ببنە کارکەری کارامە.

ڕەنگە گرنگترین هۆکارێک هاندەری دامەزراندنی پیشەسازی بێت لە ناوچە کوردییەکەدا زۆری و دەستپێڕاگەیشتنی سووتەمەنی بێت کە بەهۆی زۆریی نەوت و سەرچاوەی ئاوەوە دەتوانرێ بۆ گووراندنی وزەی ئەلەکتریک و بەڕێوەبردنی کارگەکان بەکارببرێن. ناوچە کوردییەکە هیچ گیروگرفتێکی

کەمیی کارکەری نییە بەتایبەت ئەگەر کشتوکاڵ ڕێبازێکی زانستییانە بگرێتە بەر.

## باری کۆمەڵایەتی

باری کۆمەڵایەتیی ناوچە کوردییەکە لە ڕووی خانووبەرە و نیشتەجێی و باری لەشساغی و فەرهەنگییەوە ئەگەر لە بارودۆخی ناوچەی عارەبییەکە خراپتر نەبێت ئەوا بەگشتی خراپە.

## گوندی کورد

گوندی کورد بریتییە لە چەند خانوویەکی خراپ و ناحەزی پێکەوە لکاو کە هیچ جۆرە مەرجێکی لەشساغییان تێدا نییە. خانووەکان بەگشتی لە چەند ژوورێکی تەنگەبەری کەم ڕووناک پێک هاتوون و مرۆڤ و ئاژەڵیشیان تێدا هاوبەشن. ڕەنگە خراپترین نەریتێک لە کن کوردان هەبێت، کە کارێکی خراپ دەکاتە سەر لەش سازیی گشتی، ژیانی ئاژەڵ بێت لە نێو ماڵاندا.

ئاغڵ و گەوڕ و تەویلەکان بریتین لە گەلەخان (دیوگەلێکی ناوەکی) و دەرکەکانیان بەسەر دیوەخان (ژووری دانیشتن)ەوەیە، ئەگەر دیوەخان بۆ خۆی وەک پشتیر و گەوڕ و ئاغڵ بەکار نەبرێ. هەرچی گوندیشە زۆر پیس و پۆخڵە و پیسایی ئاژەڵیش وەک گردی بەرزبەرز بەدەوروبەری ماڵاندا بڵاوبووەتەوە و پاشماوە و پیسیی نێو ماڵیش لەنێو کووچە و کۆڵانی گوندا بڵاوە. لەناو ئاواییشدا ڕێگە بەواتەی ڕاستی ڕێگە نییە. پرۆژەی ئەلەکتریک و ئاوی خاوێنیش لە گوندی کورددا تا ڕادەیەک هەر نییە.

پرۆژەی ئەلەکتریک لە لیوای سلێمانی لە سێ شاردا هەیە و پرۆژەی ئاوی خاوێنیش بەزۆری لە قەزاکاندا هەیە. گوندی کورد بەگشتی ئاوی کانی بەکار دەبەن. کانیاویش لەژێر زەوییەوە هەڵدەقوڵێ و مەودایەکی دوورودرێژ پێش ئەوەی بگاتە گوند بەژێر یا بەسەر زەویدا دەڕوات. ئەم

ئاوەڕۆیەش مادام بەدەرەوەیە ئەوا بێگومان تووشی خۆرە دەبێ و بێجگە لەوەش هەندێ ئاوی کانیاو خاوێن نییە و بۆ لەشساغی باش نییە چونکە ڕێژەی خوێی زۆر بەرزە. کانیاو بەشێوەیەکی ئاسایی بۆ خۆشۆردن و جلشۆردن و خواردنەوە بەکاردەبرێ. ڕەنگە گەورەترین بەڵگە بۆ باری پشتگوێخراوی گوندی کورد کەمیی شارەوانی بێت لە پارێزگە کوردییەکاندا. چونکە شارەوانی ئەلەکتریک و پرۆژەی دروستکردن و دامەزراندن و لەشساغی و هی دیکەی لەو جۆرە ساز دەکات، پارێزگەی سلێمانی (کە ژمارەی دانیشتوانی ٢٢٦٤٠٠ کەسە) ٧ شارەوانیی تێدایە و پارێزگەی هەولێر (کە دانیشتوانی ٢٣٩٧٧٦ کەسە) ٨ شارەوانیی تێدایە و پارێزگەی کەرکووک (کە دانیشتوانی ٣٠٧٠١٢ کەسە) ٨ شارەوانی[٨٠].

## باری لەشساغی

باری لەشساغی لە ناوچە کوردییەکەدا خراپە و تێکڕای مردنیش لەنێودانیشتواندا بەتایبەت لەنێو زارۆکاندا بەرزە. بۆیە زیادبوونی دانیشتوان لە ناوچە کوردییەکەدا- و لە عێراقیشدا بەگشتی- هەرچەندە تێکڕای لە دایکبوون زۆر بەرزە، زیادبوونێکی بەکاوەخۆیە کە لە ڕێژەی ١٪ لە ساڵێکدا تێناپەڕێ. ئەوەشمان بەم خشتەیەی خوارەوەدا کە تێکڕای لە دایکبوون و مردن لە پارێزگە کوردییەکاندا پێشان دەدا بۆ ڕوون دەبێتەوە:

| پارێزگە | ڕێژەی لەدایکبوون ٪ | ڕێژەی مردن ٪ |
|---|---|---|
| سلێمانی | ٢,٣ | ٣,٣ |
| هەولێر | ٢,٩ | ٢,٨ |
| کەرکووک | ٥,٥ | ٢,٦ |
| مووسڵ | ١٦,٩ | ٨,٨ |

خشتەی تێکڕای لە دایکبوون و مردن لە پارێزگە کوردییەکاندا
لە ساڵی ١٩٥٣دا[٨١]

شتێکی بەڵگەنەویستە کە زیادبوونی دانیشتوان بەبێ زیاتربوونی تێکڕای لە دایکبوون لە تێکڕای مردن نابێت. بەرزیی تێکڕای لە دایکبوون ناتوانێ دانیشتوان زیاد بکات، ئەگەر تێکڕای مردن بەرز بێت. بۆ لەنێوبردنی گیروگرفتی کەمیی دانیشتوان - کە عێراق گەرەکە بیکات چونکە تووشی گیروگرفتی کەمیی هێزی کار دەبێ لە کاتی فراژووتنی ئابووریدا، ئەگەر زیادبوونی دانیشتوانی هەروا بەکاوەخۆ مایەوە- دەبێ چارەسەری کێشەی بەرزی تێکڕای مردن بکرێ چونکە لە ڕاستیدا عێراق پێویستی بە بەرزکردنەوەی تێکڕای لە دایکبوون نییە. بەرپرسی یەکەمی بەرزیی تێکڕای مردنیش، مردنی منداڵە. هەرچەندە ئاماری ڕاست و دروست لەبارەی ئەم بابەتەوە کەمە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نووسەران لەسەر بەرزیی ژمارەی مردنی منداڵ ڕێکن. مس ئادەمز ئەم تێکڕایە بە ٢٥٠- ٤٠٠ لە هەزاردا دەقەبڵێنێ[٨٢]. ئەم تێکڕایە ئەگەر لەگەڵ تێکڕای دەوڵەتانی پێشکەوتوودا کە لە ٢٠- ٥٠ لە هەزاردا تێناپەڕێ بەراورد بکرێ گەلێک بەرزە[٨٣]. بێگومان وەک چەند پشکنینێک کە لەلایەن چەند پزیشکێکەوە ئەنجام دراوە و ئەو چەند ئامارە کەمانەی لەبەردەستدان سەلماندوویانە هۆی یەکەمی بەرزیی تێکڕای مردنی منداڵیش خراپی خۆراکە[٨٤].

ئامارەکانی ساڵی ١٩٥٢ لە عێراقدا ئەوە دەسەلمێنن کە ڕێژەی مردن بەهۆی لاوازی و خراپیی خۆراکەوە گەیشتووتە ٤٣٪[٨٥].

هۆکارگەلێک کە دەبنە هۆی بەرزیی تێکڕای گشتی مردن زۆر و ئاڵۆزن بەڵام گرنگەکانیان دوو هۆکارن:

**١- نزمیی داهات:** نزمیی داهاتی زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوان کە تا ڕادەیەک لە ٦٠ دینار لە ساڵێکدا تێناپەڕێ، بەرپرسی یەکەمە لە بەرزیی تێکڕای مردندا. هیچ گومان لەوەشدا نییە کە داهاتی گشتی تاکی عێراقی و بەتایبەت داهاتی لادێنشینان نزمترین ڕێژەیەکە کە هەیە. دوکتۆر دۆرین وارینەر وا باسی ئەو داهاتە دەکات کە داهاتێکە دەتوانێ تەنێ بوونی

مرۆڤ دەستەبەر بکات و هەر نزمبوونەوەیەکیشی دەبێتە هۆی مردن[٨٦].

ئەو دوکتۆرە هیچ زێدەڕۆییەکی لەو وەسفەیەدا نەکردووە. نزمیی داهات ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر هۆیە جۆراوجۆرەکانی ژیان وەک خۆراک و پۆشاک و خانوو و ماڵ. داهاتی نزم واتە کێماسیی خۆراک و پۆشاکی ناتەواو خانوو و ماڵی ناساغ. هەرچی داهاتی نزمیشە ئەنجامێکی حەتمیی سیستمی ئابووریی سەردەستە لە وڵاتدا و بەتایبەت سیستمی موڵکداریەتیی کشتوکاڵی و بەرهەمخوازیی (الإستثمار) کشتوکاڵی.

**٢- کێماسیی خزمەتی لەشساغیی:** مردن بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجامی نەخۆشییە. ئەگەر مرۆڤ بتوانێ کۆنترۆڵی دەوروبەر بکات تووشبوونی نەخۆشی یەکجار زۆر کەم دەبێتەوە، ئەو دەمەش ئەو کارانەی کە لەباری لەشساغییەوە دەکرێن کارێکی زۆر دەکەنە سەر زیادبوونی دانیشتوان. گەیشتن بەکۆنترۆڵی لەشساغیش تەنێ بەدەستەبەرکردنی خزمەتی پزیشکی ناکرێت بەڵکە دەبێ چاککردنی خۆراک و پۆشاک و ماڵ و خانوو و ئاستی گشتیی کۆمەڵایەتیشی لەگەڵدا بێت. ئەگەر ژینگەیەکی لەبار بۆ لەش سازی دەستەبەر بکرێت ئەوا کەم دەبێتەوە و پاشان نەخۆشی خۆرەکی کەم دەبنەوە و تێکڕای گشتیی مردنیش دادەبەزێ. نەخۆشییەکی خۆرەکی وەک مەلاریا بۆ نموونە هۆیەکی گرنگی بەرزبوونەوەی تێکڕای مردن بووە لە عێراقدا. یەکێ: لە نووسەران دەگاتە ئەوەی مەلاریا بەرپرسی یەکەمی زیادنەبوونی دانیشتوانی عێراقە[٨٧]. ئەگەر پارێزگەی سلێمانی وەک نموونەیەکی پارێزگە کوردییەکان وەرگرین کارتێکردنی ئەو نەخۆشییانەی بەهۆی ژینگەوە پەیدا دەبن- واتە نەخۆشییە خۆرەکییەکان - لەسەر بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردنمان بۆ دەردەکەوێ وەک ئەم خشتەیەی خوارەوە پێشانی دەدات:

| ژمارەی مردووان | هۆی مردن |
| --- | --- |
| ٦٩ | سیئاوسان |
| ٦٦ | مەلاریا |
| ٥٧ | لاوازیی |
| ٣٤ | نەخۆشیی دڵ |
| ٣٠ | هەوکردنی گورچیلە |
| ٢٣ | پاراتیفۆ |
| ٢٣ | سیل |
| ١٧ | دیزانتری |
| ٢٦٤ | نەخۆشی دەستنیشاننەکراو |

خشتەیەک هۆیەکانی مردن لە پارێزگەی سلێمانی لە ساڵی ١٩٥٢دا پیشان دەدا[٨٨]

ئەوەی کە یارمەتیدەری نزمیی ئاستی لەشسازییە لە پارێزگە کوردییەکاندا- لە تەک هۆکارەکانی ژینگەدا- کێماسیی خزمەتی لەشساغییە. لە ڕاستیدا ناوچە کوردییەکە کێماسییەکی زۆری لە خزمەتی چارەکردن و خزمەتی پارێزگاریشدا هەیە. پرۆژەی ئاوی خاوێن تا ڕادەیەک لە چەند شوێنێکی کەم لە نێو قەزا و ناحییەکاندا هەیە و پرۆژەی ژێراو و گەرماوی گشتی هەر نییە و پیسیش لە هەموو جێگەیەک لەناو گونددا هەیە و لەشکری مێشیش بەسەر هەموو شتێکدا دەدا. هەرچی ئامرازی چارەسەری نەخۆشییە وەک نەخۆشخانە و تیمارگە و پزیشک زۆر کەمن و بەشی پێویستیی دانیشتوان ناکەن، ئەم خشتەیەی خوارەوە ئەو کێماسییە گەورەیە پیشان دەدات.

| ئاژەڵ | پارێزگە | | | | سەرجەمی گشتیی عێراق |
|---|---|---|---|---|---|
| | سلێمانی | هەولێر | کەرکووک | مووسڵ | |
| ژمارەی دانیشتووان | ٢٢٦٤٠٠ | ٢٣٩٧٧٦ | ٢٦٨٠٠٥ | ٥٩٥١٩٠ | ٤٨١٦١٨٥ |
| نەخۆشخانە | ٥ | ٥ | ٥ | ٨ | ٩٨ |
| دوکتۆر | ١٠ | ١٢ | ٤٨ | ٦٠ | ٨٧٤ |
| برینپێچ، کارمەندی لەشساغی و هی دیکەی وەک ئەوان | ١١٠ | ١١٢ | ١٠٢ | ٤٣٤ | ٣٩٣٦ |

خشتەیەک خزمەتی لەشساغی لە عێراقدا پێشان دەدات[٨٩]

سەرباری کەمیی خزمەتی لەشساغی لە ناوچە کوردییەکەدا، بەزۆریش لە گوندە گەورەکان و قەزاکاندا ئەم خزمەتە هەیە. بۆ نموونە حەوت پزیشک لەو دە پزیشکەی پارێزگەی سلێمانی هەر لەنێو بازێڕی سلێمانیدان. ئەوەی پتر کارەکە بۆ گوندییەکان سەختتر دەکات و لە چارەسەری پزیشکی بێ بەشیان دەکات کەمیی ڕێگەوبانی نوێیە لە نێوان گوند و شارە کوردییەکاندا.

بەمەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە بڵاوبوونەوەی خزمەتی لەشساغی چارەسەری و خزمەتی پارێزگارییش کارێکی پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی دانیشتوان و ئەو کارەش بەدەستەبەرکردنی ژمارەیەکی زۆری نەخۆشخانە و تیمارگە و پزیشک و تیمارکار دەکرێ. پێویستیشە تیمارگەی گچکە لە ئاواییەکاندا دابمەزرێنرێ و تیمارکار و پزیشکی نۆرەکاری بۆ دابنرێ. هەرچی پارێزگاریی لە ساغییە بەهۆی دەستەبەرکردنی ئاوی خاوێنی خواردنەوە و ئاودەستخانە و گەرماوی گشتی و دوورخستنەوەی پیسایی لەنێو گوند و بڵاوکردنەوەی خاوێنی و پڕوپاگەندەی لەشساغییەوە لە نێو گوندیشدا دەکرێ.

## باری فەرهەنگی

لە بارەی خزمەتی فەرهەنگییەوە لە ناوچە کوردییەکەدا کێماسییەکی ئاشکرا هەیە و نەخوێندەواری لەنێو کوردەکاندا یەکجار بەربلاوە و ڕەنگە لە هەر گوندێکدا پتر لە دوو یا سێ کەس نەبێت خوێندنەوە و نووسین بزانن و هەندێ جاریش مەلا تاکە کەسێکە کە نەخوێندوو نییە. ئەم خشتەیەی خوارەوە ڕێژەی خوێندەواری لە ناوچە کوردییەکەدا پێشان دەدات.

| دانیشتوان | | پارێزگە | | | | سەرجەمی گشتی لە عێراق |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سلێمانی | هەولێر | کەرکووک | مووسڵ | |
| خوێندووان | نێر | ٩٠٨٥ | ٤٨٠١ | ١٧١٤٢ | ٢٦٠٢٤ | ٣٣٣٤٦٤ |
| | مێ | ١٢١٩ | ١٠٠٩ | ٣٣٩٢ | ١٢٨٠٢ | ٤٨١١٢ |
| | سەرجەم | ١٠٣٠٤ | ٩٤١٠ | ٢٠٥٣٤ | ٤٨٨٢٦ | ٤٠٧٥٧٦ |
| نەخوێندووان | نێر | ٧٣٠٤٨ | ٧٨٢٦٣ | ٨٨٧٣٣ | ١٦٢٩٧٨ | ١٣٩٤٨٤٢ |
| | مێ | ١٠١٨٨٦ | ١٠٧٩٤٠ | ١٢٦٢٤٧ | ٢١٢٠٨٦ | ١٩٢٤٦٢٧ |
| | سەرجەم | ١٧٤٩٣٤ | ١٨٦٢٠٣ | ٢١٤٩٨٠ | ٣٧٥٠٦٤ | ٣٣١٩٤٤٩ |
| سەرجەمی گشتی | | ٢٢٦٤٠٠ | ٢٣٩٧٧٦ | ٢٨٦٠٠٥ | ٥٩٥١٩٠ | ٤٨١٦١٨٥ |

خشتەی ژمارەی خوێندووان و نەخوێندووان لە ناوچە کوردییەکەدا[٩٠]

هۆی کەمیی ژمارەی خوێندووان لە ناوچە کوردییەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ کەمیی خزمەتی فێرکردن ئەوەش لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەردەکەوێ کە ژمارەی فێرگەکان لە ناوچە کوردییەکەدا پێشان دەدات:

| دانیشتوان | | پارێزگە | | | | سەرجەمی گشتی لە عێراق |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | سلێمانی | هەولێر | کەرکووک | مووسڵ | |
| فێرگەی سەرەتایی | کوڕان | ٥٧ | ٥٩ | ٧١ | ١٥٤ | ١٠٩٤ |
| | کچان | ٩ | ٨ | ١٣ | ٢٩ | ٢٥٦ |
| | باخچەی ساوایان | ١ | ١ | ١١ | ١٦ | ١٠١ |
| | سەرجەم | ٦٧ | ٦٨ | ٩٥ | ١٩٩ | ١٤٥١ |
| فێرگەی ناوەندی و دواناوەندی | کوڕان | ٣ | ٣ | ٦ | ٩ | ٩٢ |
| | کچان | ١ | ١ | ٢ | ٤ | ٤٢ |
| | سەرجەم | ٤ | ٤ | ٨ | ١٣ | ١٣٤ |
| ژمارەی دانیشتوان | | ٢٢٦٤٠٠ | ٢٣٩٧٧٦ | ٢٨٦٠٠٥ | ٥٩٥١٩٠ | ٤٨١٦١٨٥ |

خشتەی ژمارەی فێرگە سەرەتایی و خوێندنگە ناوەندی و دواناوەندییەکان
لە ناوچە کوردییەکە لەساڵی ١٩٥٣دا[٩١]

بێجگە لە کەمیی فێرگە و خوێندنگە لە ناوچە کوردییەکەدا بەشینەوەیشی بەسەر گوند و ناحییەکاندا بەشێوەیەکی ڕەوا نییە، بەڵکە بەزۆری لە نێو قەزاکاندا بەتایبەت و لە هەندێ گوندی گەورەدا هەن، ئەوەش بووەتە هۆی بێ بەش کردنی زۆر گوند لە خوێندەواری. بەهەرحاڵ فێرگەکانی گوندەکان بەم شێوەیەی ئێستایان کێماسییەکی زۆریان لە ڕووی مامۆستا و کەرەستە و شتومەک و ئامرازی پێویستی دیکەی فێرکردنەوە هەیە و زۆربەی بیناکانیشیان بەکەڵکی تێدا دانیشتن نایەن. مامۆستاکانیش کە دادەنرێن بۆ کارکردن لەو گوندانەدا لەبەرئەوەی ئەو گوندانە هیچ جۆرە ئامرازێکی ڕابواردن و کات بەسەربردن و تەنانەت ئامرازی پێویستی ژیانی شارستانیتیشی تێدا نییە لە کارەکانیان ناڕازین و ئیدی بەئاسایی دەبێتە هۆی ئەوەی کار و ئەرکی خۆیان پشتگوێ بخەن.

چارەسەری ئەم گیروگرفتەش بەوە دەکرێ کە بە باشی مامەڵەی

مامۆستایانی گوندان بکرێ و ئامرازەکانی ژیانیان بۆ دەستەبەر بکرێن و بەشێوەیەکی ڕەوا قەرەبوو بکرێن، بەو جۆرەش بەشێکی گرنگی گیروگرفتی فێرکردن بەگشتی چارەسەر دەکرێت.

گیروگرفتی فێرکردن ڕاستەوخۆ بەگیروگرفتی ئابوورییەوە گرێ دراوە. باری خراپ و نالەباری ئابووریی وەرزێران لە چوونی مندالآن بۆ فێرگە و خوێندنگە کەم دەکاتەوە. بەهۆی گەندەڵیی تەواوی سیستمی کشتوکاڵەوە وەرزێر پێویستی بەکارکەری زێتر هەیە لە کاروباری کشتوکاڵدا، ئەوەش کارێکی وا دەکات هەموو ئەندامانی خێزان پشتیوانییەکی گرنگ بن لە کاری کشتوکاڵدا و واش دەکات چوونی مندالآنی وەرزێران بۆ فێرگە ببێتە کارێک کە لە توانستدا نەبێت. لەبەرئەوە چارەسەری گیروگرفتی خوێندنیش بەچارەسەری گیروگرفتی گشتیی ئابوورییەوە بەستراوە.

لە ناوچە کوردییەکەدا گیروگرفتێکی تایبەتیش هەیە ئەویش گیروگرفتی زمانی دەرس گوتنەوەیە. زمانی کوردی لە فێرگە سەرەتاییەکاندا دەخوێندرێ بەلآم زمانی عارەبی بۆ خوێندن لە خوێندنگە ناوەندی و دواناوەندییەکاندا دەخوێندرێ. گومانیش لەوەدا نییە ئەم گواستنەوە کتوپڕە لە خوێندن بە زمانی کوردی بۆ خوێندن بەزمانی عارەبی کارێکی یەکجار سەختە بۆ کوردەکان. کوردەکان وەک لە بڕیارەکانی کۆمەڵەی نەتەوکاندا لە ساڵی ١٩٢٦دا هاتووە مافی ئەوەیان هەیە بە زمانی نەتەوەیی خۆیان بخوێنن و ئەوەش بۆ وەزارەتی زانیاری کە بۆ دانانی کتێبی کوردی لەبار و وەرگێڕانی کتێبی دیکە لە زمانی عارەبییەوە کۆمێتە ساز بکات، کارێکی زۆر نییە. دەکرێ لە پاڵ ئەوەشدا زمانی عارەبی لە فێرگە و خوێندنگە کوردییەکاندا وەک زمانێکی بنەڕەتی بخوێندرێ بۆ ئەوەی خوێندن بۆ خوێندکارانی کورد لە کۆلیجە عارەبییەکاندا هاسان بکرێت تا لە داهاتوودا ئامرازی دامەزراندنی کۆلیجی کوردی دەستەبەر دەکرێ. گوێنەدان بە زمانی کوردی لەلایەن حکوومەتەوە هەمیشە سەرچاوەی گلەیی و نارەزایی کوردان بووە. دەبێ مامەڵەکردنی دانیشتوانی یەک وڵات بە جیاوازیی نەتەوەکانیشیەوە مامەڵەیەکی یەکسان بێت.

## پێکهاتەی جڤاکی(*)

ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی لە کۆمەڵگەی کورددا لە زۆر ڕووەوە وەک ڕێکخستنی کۆمەڵگەی عارەبە. دانیشتوان بەگشتی دەبنە دوو بەشەوە: خێڵەکییەکان و ناخێڵەکییەکان.

## خێڵەکییەکان

خێڵەکییە کوردەکان لە کۆچەر و نیوەکۆچەر و نیشتەجێیان پێکهاتوون، بەڵام خێڵە کۆچەرەکان بەردەوام لە کەمیدان و زۆریان جێگیر بوون و ئەوانی دیکەیشیان بەرە و جێگیربوون دەچن: بۆ نموونە لە پارێزگەی سلێمانیدا تەنێ چەند تیرەیەکی کەمی هۆزی بلباس هەن کە هێشتا کۆچەرن. بەڵام لە پارێزگەی هەولێردا خێڵی هەرکی بەزۆربەی تیرەکانییەوە هێشتا کۆچەرن و خێتی سوورچیش لە پارێزگەی مووسڵدا هەر وان.

خێڵەکان وەک نەریت کاری ئاژەڵداری دەکەن و گرنگترین ئاژەڵیشیان بزن و مەڕن. ئابووریی ئەم ناوچانەش لەسەر بازرگانی بە بەرهەمی ئاژەڵەوە لە خوری و موو و شیرەمەنی وەستاوە و بێجگە لەوەش بازرگانی بەئاژەڵی زیندوو خۆیەوە دەکرێ. لەوانەشە هەندێک کەس لەنێو ئەم خێڵانەدا پارچە زەویی بچووک بچووک لە ناوچەی لەوەڕگە هاوینەکاندا بۆ چاندن بەکارببەن.

خێڵە کوردە کۆچەرەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لە هاوین و زستاندا لە نێوان بەرزایی و نزماییەکاندا دەگوێزنەوە. لە وەرزی هاویندا بۆ ناوچە بەرزاییەکان لە کوردستانی ئێران یا کوردستانی تورکیا- پێش داخستنی

---

(*) لە لاپەڕە ٦٥ی کتێبەکەدا لە بری سەردێڕی پێکهاتەی جڤاکی نووسراوە الوضع الصحی واتە باری لەشساغی کەچی پێشتریش لە لاپەڕە ٥٧ دا هەر ئەو سەردێڕە (الوضع الصحی) هاتووە و باس لە باری لەشساغیش کراوە. ئەوجا من لە وەرگێڕانەکەدا ئەو باری لەشساغی (الوضع الصحی)یەی لاپەڕە ٦٥ی کتێبەکەم کردە پێکهاتەی جڤاکی چونکە لەوێدا نووسەر باسی باری جڤاکی دەکات- وەرگێڕ.

سنوورەکانی ئەم دوو وڵاتە و قەدەغەکردنی هاتوچۆی خێڵە کوردەکان- یا بۆ ناوچە دوورەکان لە باکور کۆچ دەکەن و لە زستانیشدا دەگەڕێنەوە بۆ دەشتاییە نزمە گەرمە بژوێنەکان. کەواتە کۆچکردنی ئەم خێڵانە بریتییە لە کۆچکردنێکی وەرزی کە هەلومەرجی ژینگە لە ڕووی لەوەڕ و گەرمییەوە دەیسەپێنێ. دوای نەمان و تەواوبوونی گیا لە لەوەڕگەکانی دەشتاییەکاندا لە وەرزی زستاندا، بەرزاییەکان لە هاویندا بڕوێن و زەمەندە، بەڵام ژیان لە بەرزاییەکاندا لە وەرزی زستاندا بەهۆی زۆریی سەرما و تووشییەوە سەختە و ناکرێ، ئەوجا خێڵەکان بەڕانە پەزەکانیانەوە بەرەوخوار بۆ گەرمی و گیای نوێ دەگەڕێنەوە. ئەم خێڵانە لە دەواردا دەژین و گواستنەوەیان لە نێوان لەوەڕگە هاوینە و زستانەکاندا هاسانە.

هەرچی خێڵە نیوەکۆچەرەکانە وەک نەریت لە زستاندا ماڵی جێگیریان لە ناوچە دەشتاییەکاندا هەیە و بێجگە لە ئاژەڵداری لە زستانیشدا کاری کشتوکاڵ دەکەن. بە هاتنی وەرزی هاوین لە کاتێکدا لە گوندە سەقامگیرەکاندا چەند پیاو و پیر و ژن بۆ پاراستنی کێڵگە و ماڵەکان دەمێننەوە، زۆربەی پیاوانی خێڵ بۆ لەوەڕگەکانی چیابەرزەکان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ کۆچ دەکەن. مەزنترین گیروگرفتێک تووشی ئەم شوانکارانە دەبێت گیروگرفتی لەوەڕگەیە. هەرچەندە هەریەکێک لەو خێڵانە لە ناوچەیەکی تایبەتیدا کە بەموڵکی خۆی دەزانێت یا ڕەنگە لە ڕاستیدا لە خاوەن موڵکە ڕاستەقینەکەی بەکرێ گرتبێ ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ناتەبایی و شەڕوشۆڕ زۆر جاران لە ناوچە بژوێنەکان لە نێوان خێڵە جیاوازەکاندا ڕوو دەدات.

هەرچی خێڵە جێگیربووەکانە واتە ئەوانەی کە کاری کشتوکاڵ دەکەن و لە گوندە بەردینە جێگیربووەکاندا دەژین، ئابووری و ژیانیان بەگشتی لە ئابووری و ژیانی خێڵە کۆچەر و نیوەکۆچەرەکان جیاوازە.

هەرچی سیستەمی جڤاکییە کە لە نێو خێڵە کوردەکاندا بە هەموو جۆرە جیاوازەکانیانەوە سەردەستە، سیستەمی خێڵەکییە بەشێوە و تایبەتمەندییە

دیارەکانییەوە، هەرچەندە ڕێکخراوە خێڵەکییەکان بەواتەی کۆنی تێکچووە و تا ڕادەیەک تواوەتەوە. لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستییەی کە بۆ هەموو پشکنەرێک دیارە جەخت بکرێتەوە، ئەو ڕاستییەش ئەوەیە کە پێوەنداریەتیی خێڵەکی هێزە کۆنەکەی لە دەست داوە و کەوتۆتە بن دەسەڵاتی بەرژەوەندی کەسییەوە و ئەوەی پێی دەگوترێ دڵسۆزی بۆ خێڵ نەماوە.

بینای خێڵی کوردی جیاوازییەکی بنەڕەتیی لەگەڵ بینای خێڵی عارەبیدا هەیە. بڕبڕەی پشتی خێڵی عارەبی پێوەندیی خزمایەتی و بنەچەیە، بەڵام بڕبڕەی پشتی خێڵی کوردی زەوییە. لە ڕاستیدا بەشەکانی یەک خێڵی کوردی ڕەنگە بەهیچ خزمایەتییەک پێوەندیان بەیەکەوە نەبێت بەڵام ئەم بەشە جیاوازانە لە یەک ناوچەدا دەژین و گوێڕایەڵی فەرمانی تیرەیەکن لە تیرەکان کە ئەویش خێزانی دەسەڵاتدارە لە نێو خێڵەکەدا.

پێوەندی تیرەکان لەگەڵ یەکتردا لە پابەندی و گوێڕایەڵی (ولاء)یاندا بۆ یەک دەسەڵاتداریەتیی نێوەندەکی خۆی دەنوێنێ. لە نێوان تیرەکانی یەک خێڵیشدا ئەگەر یەکێکیان بکەونە شەڕەوە لەگەڵ خێڵێکی دیکەدا هاریکاری دەکرێ. کەواتە لە نێوان بەشە زۆرەکانی یەک خێڵدا جۆرە هاوپەیمانییەک هەیە.

کاروباری خێڵ لەلایەن سەرۆکێکی بەرزەوە کە یەکێکە لە ئەندامانی خێزانی دەسەڵاتدار بەڕێوە دەبرێ و ئەنجوومەنێکی ڕاوێژگاری پێکهاتوو لە سەرۆکی تیرەکانی دیکەی خێڵ هاریکاریی ئەو سەرۆکە بەرزە دەکات.

ئەندامانی خێزانی دەسەڵاتدار پێیان دەگوترێ ئاغا یا بەگ و ئەمانەش لە ڕاستیدا هیچ جۆرە سەرپشکییەکی ئابووریی تایبەتییان نییە. بەڵام لەکن هەموو ئەندامەکانی خێڵ ڕێزیان دەگیرێت. ئەو چینە ئەگەر خێڵەکە کۆچەر بێت ئەوا ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵیان هەیە ئەگەریش خێڵەکە جێگیر بێت ئەوا پانایییەکی پان و بەرینی زەویی کشتوکاڵییان هەیە.

سەرۆکی بەرزی خێڵ پارەیەک بۆ خەرج و تێچوونی دیوەخان تەرخان

دەکـات. دیوەهان جـێی کـۆبوونەوە و دەمــەتەقــە و کـات گـوزەراندن و و باسکردنی کـاروبار و پێشکەشکردنی گـازانده و نارەزایی و ئەنجـامـدانی دادگەریی نێوان ئەندامانی خێڵە. سەرخێڵ دەبێ چاوتێر و ئازا و و خاوەن پیـتۆڵـی و هۆزان بێت. سەرۆکایەتی خـێڵـیش وەک باوە میـراتییـە، بەڵام خـێڵ مـافی هەڵبـژاردنی سـەرۆکـێکی دیکەی هەیە ئەگـەر ناشـایسـتـەیی کەسێکی دیاریکراو سەلمێندرا. لە نێو خێڵە ڕەوەندەکاندا هێشـتا سەرخێڵ خـاوەن دەسـەڵات و فـەرمـانـە و بەشـێـوەیەکی ئاسـاییش بەرزترین تاکـە فەرمانڕەوایە و مافی دەیەکی ئاژەڵی خـێڵەکەی هەیە. هەرچی دەسەڵاتی سەرۆکە لە نێو خێڵە جێگیربووەکاندا بەتەواوی کز بووە و سەرۆک تەنێ دەسەڵاتێکی ئەدەبیی بەسەر ئەندامانی خێڵەکەیدا هەیە.

لە ڕاسـتیدا سەرخێڵی جێگیربوو ئێسـتاکە بووە بەمولکداریکی گەورە و پێـوەندیشی لەگـەڵ ئەندامـانی خـێـڵـەکـەیدا پێـوەندی مـولـکدار و وەرزێرە. زۆربەی جاریش سەرخێڵ یا ئەندامانی خێزانەکەی لەبەرئەوەی کە سەرۆکی خێڵە مـولـکـایەتیی زەوییـەکـانی خـێـڵـی بەناوەوەیە، بەڵام مـولـکـایەتی ئەو زەوییانە مولکایەتییەکیی ڕاستەقینە نییە کە لە بنەڕەتدا بەهۆی کڕینەوە پەیدا بووبێت. هەرچی ئـەندامـانی خـێـزانی دەسـەڵاتدارە لە خـێـڵـدا زەوییەکانی دیکەی خێڵ لەژێر دەستی ئەواندایە و ئەوان ئەگەر بۆخۆیان لە گوندێکی دیاریکراودا ژیان ڕاستەوخۆ کـاروباری ئەو زەوییانە بەڕێوە دەبەن یا بەهۆی جـێگرێکەوە بەڕێوەی دەبەن کـە نـێـوی کـوێخـای لێ دەنرێ و کوێخاش دەکاتە هەڵبژێردراوی گوند (موختار). پێوەندی ئەمانەش لەگەڵ ئەندامی خـێـڵـەکـەیاندا پێـوەندی خـاوەن مـولـک و وەرزێـرە، بەڵام بەوەی بەشێک لە بەرهەمی کشـتوکاڵ- کە دەکاتە نیو یا سێیـەک لە بەرووبوومی هاوینەدا و دە یەک لە بەروبوومی زستانەدا-- ببەن قایل دەبن و هیچ جۆرە سەرمایەیەکیش بۆ کاروباری زەوی ناخەنە گەڕ (إستثمار) و ناشـتوانن زەوی لەوانەی دەیچـێـنن بسـێـننەوە. ئەم ئاغـا و بەگـانـە دەسـەڵاتی ڕاستەقینەیان بەسەر کاروباری نێوخۆی گوندەوە هەیە. هەریەکەشیان چەند

چەکدارێکی تایبەتی خۆیان هەیە کە کاریان تەمێکردنی خەڵکانێکە لەفەرمانی ئاغا دەردەچن یا گیروگرفت ساز دەکەن. خێڵەکییەکان چارەسەری گیروگرفتەکانی خۆیان بەهۆی سەرۆکەکانیانەوە پێ چاکترە و بەدەگمەن هاتوچۆی کارگێڕی میری دەکەن. ئەو کارە ناگەڕێتەوە بۆ بڕوا و خۆبەستنەوە بەسیستەمە خێڵەکییەکەیانەوە بەڵکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مامەڵە خراپەی لەلایەن نوێنەرانی حکوومەتەوە- بەتایبەت لەلایەن پۆلیسەوە- ڕووبەڕوویان دەبێتەوە و دەشگەڕێتەوە بۆ خاووخلیچکی نواندن و گرێوگۆتاڵ سازکردن لەبەردەم چارەسەری گیروگرفتەکانیاندا تا وای لێ دێ بڕوایان بەحکوومەت نەمێنێ. دوکتۆر لیچ کە بە وردیی لەو مەسەلەی کۆڵیوەتەوە باسی پێوەندی نێوان کارگێڕیی حکوومەت و دانیشتووە خێڵەکییەکان بەم شێوەیە دەکات: «بەڕێوەبەری ناحییە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەسەڵاتی بەسەر چەند پۆلیسێکدا هەیە کە هۆی پێوەندین لە نێوان دەسەڵاتداریەتیی میری و خێڵدا. ڕەفتاری خراپی ئەم کارمەندە بچووکانە- کە نوێنەرایەتیی خراپترین ڕووی ڕژێمی فەرمانڕەوادەکەن- بەرپرسی یەکەمە لەوەی کە خێڵەکییەکان ڕوو لە حکوومەت نەکەن.

میستەر های یش لە سەردەمی خۆیدا وای باس کردوون کە ئەمانە کەسانێکی دەمپیس و بێ ڕەوشت و ڕەق و بێ مەشق و بێ باوەڕن و دەسەڵاتیشیان بەکاردێنن بۆ ئەوەی تا بتوانن کاری ناقانوونی و بێ گوێیی بکەن و لەوەش دەچێ پۆلیسی ئەمڕۆ لەگەڵ ئەوانەی کە های باسی کردوون هیچ جیاواز نەبن» (٩٢).

خۆبەستنەوەی خێڵەکییان بە سیستەمی خێڵەکییەوە لە خۆشویستنی ئەو سیستەمە نییە بەڵکە بەهۆی نەریت و بەرژەوەندییەوەیە. یەکێک لە کارگێڕەکان بەم جۆرەی خوارەوە باسی هەستی خێڵەکییەکان دەکات: «خێڵەکییەکان لە قووڵایی دڵیانەوە حەز دەکەن لەم سیستەمە دووفاقەیەی سەرۆکایەتی خێڵ و دەسەڵاتداریەتی حکوومەتە ڕزگاریان بێت و

بەشێوەیەکی ئاساییش بوونی حکوومەتێکی دادگەر و بەهێزیان پێ باشترە. بۆ وەدەستهێنانی دڵسۆزیشیان بۆ حکوومەت لە جێبەجێکردنی بنەماکانی دادی جڤاکی لەنێو دانیشتواندا زیتر هیچی دیکەی ناوێ»[٩٣].

## ناخێڵەکییەکان

ئەورۆکە ناخێڵەکییەکان بوونەتە زۆربەی دانیشتوان و ژمارەشیان ساڵ لە دوای ساڵ زیاد دەکات. پرانیی ئەمانە لە ڕاستیدا بۆ خۆیان لە بنەڕەتدا خێڵەکی بوون و بەزۆرییش شوانکارە بوون، بەڵام بەلەدەستدانی ئاژەڵەکانیان و پەنا بردنە بەر کشتوکاڵ ئیدی پێوەندیان بەخێڵە ئەسڵییەکانیانەوە پچڕاوە. ڕەنگە جوێبوونەوەیان لە خێڵەکانیان هەندێ جار بەهۆی ناتەباییەکەوە لە نێو خێزان یا خێڵدا بووبێت. ناخێڵەکییەکان لە گوندی جێگیربوودا دەژین و کاری کشتوکاڵی دەکەن. بەشێوەیەکی ئاساییش ئەم وەرزێرانە زەوییەک بەکار دەبەن هی موڵکدارانێکە بۆ خۆیان لەو گوندانەدا ناژین و هی سەرخێڵەکان نییە، بۆیە ئەو موڵکدارە هەر کاتێ بیەوێ دەتوانێ لە زەوییەکان وەدەریان نێ. بەشێکیش لەمانە نموونەی چینی موڵکدارە گچکەکانن کە خاوەنی پارچە زەویی بچووکن.

یەکەتیی ڕیکخستنی ناخێڵەکییەکان گوندە، کە دانیشتوانی پێوەندێکی ڕاستەوخۆیان بەکارگێڕی حکوومەتەوە هەیە. ئەگەر گوندەکە بەتەواوی موڵکی یەک موڵکدار بێت ئەو دەمە ئەو موڵکدارە وەک سەرخێڵ وایە و ڕاستەوخۆ کاروباری گوند بەڕێوە دەبات یا لە ڕێگەی سەرکارەوە کە ئەویش کاری بەڕێوەبردنی زەوی و سەرپەرشتی وەرزێرەکان دەکات.

هەندێک موڵکدار پیاوی چەکداریشیان هەیە کە هێزی ڕاستەقینەی موڵکدارن و ئەوانیش وەک چەتەی سەرخێڵەکانن. کارگێڕیی میریش بەزۆری هەمیشە لایەنگیری موڵکدارانە.

گوند کوێخا (موختار) یەک بەڕێوەی دەبا کە دانیشتوانی گوند

بەرەزامەندیی موڵکدار هەڵیدەبژێرن یا موڵکدار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یا تیان بۆخۆی دەستنیشانی دەکات. کوێخا هۆی پێوەندی نێوان کارگێڕیی میری و گوندنشینەکانە و دەشبێتە هۆی پێوەندی نێوان دانیشتوانی گوند و موڵکدار یا جێگیرەکەی کە سەرکارە. بۆ یارمەتیدانی موختار بۆ چارەسەری گیروگرفتی گوند ئەنجوومەنێکی پیاوماقووڵانیش هەیە پێیان دەگوترێ پیران (ئیختیاران). دەسەڵاتی حکوومەت بەسەر گوندە ناخێڵەکییەکاندا لە دەسەڵاتی بەسەر گوندە خێڵەکییەکاندا زێترە.

هەرچی ڕێکخستنی خێڵەکیی کوردانە بەهیچ شێوەیەک لە ڕێکخستنی عارەبی جیاواز نیە و هەردووک هەر بەگوێرەی سیستمی باوکزاڵی (پاتریارکی) بەڕێوە دەچن. باوک بەشێوەیەکی ئاسایی گەورەی خێزانە و پاشان نێرینە (کوڕان) گرنگن و دوای ئەوان مێیینە (کچان) و ژنیش پاجێگەی هەیە(٩٤). بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ژنی کورد جێگەیەکی باشی هەیە و زۆر جاران پلەی سەرۆکایەتی وەردەگرێ وەک چۆن عادیلە خان لە هەڵەبجە و حەپسە (حەفصە) خان لە سلێمانی وەریان گرت.

## کەسایەتیی کورد

بێگومان تاکی کورد لە دەرێی کوردستان سەربازێکی نەناسراو و چەوساوەیە. ناویانگیشی چ لەلایەن هاوسێکانییەوە و چ لەلایەن ڕۆژئاواییەکانەوە لە شێواندن ڕزگاری نەبووە. دەکرێ ئەم دوژمنایەتییەی نێوان کورد و هاوسێکانیان بەشێوەیەکی جوگرافی لێک بدەینەوە.

کوردانی شوانکارەی دڕ و توند و تیژ زۆر جاران دەیاندا بەسەر دانیشتوانی دەشتاییەکانی دەوروبەری خۆیاندا لە وەرزێرانی عارەب و ئێرانی و تورک و بەروبوومی کشتوکاڵیانیان بەتاڵان دەبردن و دوژمنایەتیی نێوان شوانکارە و وەرزێریش دوژمنایەتییەکی ناسراوە. بێجگە لەوەش سیستمی دەرەبەگایەتیی سەردەستیش نەخشێکی مەزنی لەو دوژمنکارییەدا هەبووە.

هەرچی بەدناویی کوردە لە جیهانی ڕۆژئاوادا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێکدادانانەی لە نێوان ئەوان و گەلانی فەلەی هاوسێیاندا ڕوویان داوە.

گەلێک لە گەڕیدە ڕۆژئاواییەکان چۆنیەتیی ئەو پێکدادانانەیان تۆمار کردووە و بەخراپترین شێوە باسی کوردیان کردووە و بەدڕندەترین مرۆڤیان داناون(٩٥). ئەو جۆرە باسکردنانە زۆر نووسەری لایەنگر و گەڕیدەی نەزانی هان داوە بۆ پەڵەدارکردنی ئاکار و ڕەوشتی کورد بەگشت کێماسی و نزمییەک کە هەن وەک ناپاکی و دەمارگیری و هۆڤێتی و هی دیکەی وەک ئەوانە. بەڵام لە پاڵ ئەو نووسەرە نەزانانەدا نووسەر و گەڕیدەی دیکە هەبوونە کە لە نێو کورددا ژیاون و لە نێزیکەوە و بە وردی لە ڕەوشت و سروشتیان کۆڵیونەتەوە و زۆریان لا پەسەند بووە. میستەر ڕیچ کە لە گەڕیدە ئینگلیزە پێشینەکانە و خاوەن سەرنجی وردە بەم شێوەیە باسی ئاکار و ڕەوشتی کورد دەکات: «کورد خەڵکێکی ناسک و جڤاکین و واتەی گەوەزەیی و لووتبەرزیی بەتاڵ نازانن و ئێرەیی بەیەکدی نابەن».

نەشم بیستووە کوردێک سووکایەتی بەدوژمنێکی بکات ڕادەی دوژمنایەتیشیان هەر چۆنێک بووبێت»(٩٦).

گەڕیدەی فرانسی بندێر بەم جۆرە باسی کورد دەکات: «خەڵکێکن سیمایان جوانە، بەهێزن زیرەکن و باشن. ئەگەر بێت و شارستانییەت شوێنەواری خۆی لە سەریان دانێ بێگومان لە هاوسێ تورک و ڕووسەکانیان ئاستیان بەرزتر دەبێت»(٩٧).

بەڵام سۆن بەم شێوەیە باسی کورد دەکات: «دڵسۆزیی هەمیشەیی، ڕێزگرتنی پەیڤ، سۆز بۆ خزمان، چاکترین مامەڵەی ژن، هەستی ئەدەبیی ناسک، خۆشویستنی شیعر، ئامادەیی بۆ خۆبەختکردن، شانازیکردنێکی جوان بەنەتەوە و نیشتمان... ئەوەیە کورد»(٩٨).

لەمەڕ کەسایەتی کورد و ئاکاری کوردەوە ئێمەش بەوردی لێکۆڵینەوەمان کردووە و گەیشتووینەتە ئەو ئەنجامانەی کە نووسەرە بەویژدانەکان پێی گەیشتوون. بۆ لێکۆڵەرەوەش وەدرۆخستنەوەی گەڕیدە و نووسەرانی نەزان

لە بارەی ئاکاری کوردەوە بەشیکردنەوەیەکی سانا لە مەڕ هەلومەرجی کۆمەڵایەتی مرۆڤایەتیی کۆمەڵگەی کوردەوە، هاسانە.

کوردەکان بەوە وەسف کراون کە جەردە و ڕێگرن، شەڕخوازن، غەددار و ناجڤاکین. هەرچی مەسەلەی جەردەیی و ڕێگرییە بێگومان ئەوە کارێکە زۆربەی گەلان لە قۆناغێکی فراژووتنیاندا کردوویانە. هەندێ دەستە و تاقمی کوردیش بەهۆی بارودۆخی تایبەتەوە کردوویانە. کوردستانیش بەگشتی یەکێکە لە ناوچە سەختەکانی جیهان- بەڕای مامۆستا فلیر- و مرۆڤیش لەم جۆرە ناوچانەدا بۆ دەستەبەرکردنی ژیانی خۆیان لە زۆرانبازییەکی هەمیشەییدان لەگەڵ سروشتدا. ئەم جۆرە زۆرانبازییە هەمیشەییەش بێگومان هەوەس و مەیلی تاڵانکردن دەخولقێنێ ئەگەر حکوومەتێکی بەهێز لە ئارادا نەبێت بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵ بێت. ئەم جۆرە مەیلەش بەزۆری لای گەلانی ناوچە تووش و ڕژدەکان- ئەوانەی کە خاکەکانیان پێویستیی دانیشتوانیان تێر ناکات و دەسەڵاتدارییەتی حکوومەتیشیان تێدا لاوازە یا هەر نییە- وەدی دەکرێ.

هەرچی شەڕخوازیی کوردانە ئەوە تەنێ نیشانەی شوانکارەتییە کە پیشەی زۆربەی کوردان بووە و نیشانەی نەبوونی ئاسایش و حکوومەتێکی بەهێزیشە. شوانکارەکان دەبێ بۆ داکۆکیکردن لە ئاژەڵ و لەوەڕگەکانیان یا لەبەر شەڕی وەرزێران هەمیشە ئامادەی شەڕ بن.

بێگومان دەبێ وەرزێرەکانیش ئامادەی پاراستنی زەوی و سەرچاوەی ئاوەکانیان بن لە شوانکارە پەلاماردەرەکان یا لە داگیرکردنی شوانکارە بەهێزەکانیان. ئەم ململانێ هەمیشەییە کە دەرەنجامی سیستمی خێڵەکی و دەرەبەگایەتیی سەردەستە وای لە کورد کردووە ببێتە مرۆڤێکی شەڕکەر. بێجگە لەوەش سیستمی خێڵەکی بەپێی سروشتی خۆی خێڵ و تیرە و هۆزان دەخاتە شەڕی هەمیشەییەوە.

بەکاربردنی وشەی غەدریش بۆ وەسفکردنی وریایی کورد وەسفێکی ڕاست نییە. دەبێ دان بەوەدا بنێین کە کورد لە غەریب دەترسێ تا لێی

دڵنیا دەبێ و ئەم ترسەشی دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری مێژوویی و ئابووری.

شوێنگەی جوگرافیی کوردستان هەر لەدێر زەمانەوە کردوویەتی بەشانۆی جەنگ، چونکە هەمیشە پردێک بووە لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ئەم شوێنگەیەی کوردستان لە نێوەڕاستی هەردوو دەوڵەتی تورکیا و ئێرانی ململانێکەردا بووەتە هۆی ئەوەی خاکی کوردستان هەر لە سەرەتای سەدەی پازدەیەمەوە ببێتە گۆڕەپانی جەنگ و پێکدادانی دژوار لە نێوان هەردوو سوپای تورک و ئێراندا. ئەم ڕەوشە مێژووییە، سەرباری باری خراپی ئابووری و سیستمی خێڵەکیی کوردان، وای لە کورد کردووە لە هەموو نامۆیەک کە مشەخۆریی بەسەر وڵاتەکەیدا دەکات بەگومان بێت و پاشانیش سڵی لێ بکات. هەرچی ئەو ڕۆحە کۆمەڵایەتییەیە کە کوردی پێ تاوانبار دەکرێ لە ڕاستیدا دزاندنی نامۆ نییە، بەڵکە سیفەتێکە بەهۆی گۆشەگیریی جوگرافیی گوندی کوردەوە پەیدا بووە. تووشی و ڕکیی خاکی کوردستان و نەبوونی ڕێگەوبان تێیدا سەرباری زستانی سەختی وای لە گوندی کورد کردووە لە جیهانی دەرەوە دابڕێ و هیچ دەرفەتێکی بۆ کورد نەڕەخساندووە کە تێکەڵاوی نامۆیان ببێ. بۆیە لە کورد چاوەنواریی ئەوە ناکرێت دەستبەجێ لەگەڵ نامۆیاندا بکرێتەوە پێش ئەوەی هۆگریان ببێت.

لە ڕاستیدا مرۆڤی کورد بەگشتی خاوەنی ڕەوشت و ئاکارێکی یەکجار پەسندە. بێگومان ڕووخۆش و کراوە و گەرمیشە. ئەوەش لە چۆنیەتیی سەلامکردنی کورددا دەردەکەوێ. ئەگەر گوندییەک تووشی ببێ بەتووشی برادەرێکی خۆیەوە لەمێژ بێ نەیدیتبێ بەتوندی دەستی یەکدی دەگوشن و هەریەکەیان قۆڵی ئەوێ دی ماچ دەکات و ڕوومەتیشیان ڕوون و گەش دەبێتەوە. هەرچی نازکیی کوردیشە بەرامبەر بەغەریب بەپێشوازیکردنی گەرمیدا دەردەکەوێ کە بەدرێژایی کات چەند جاران لەسەریەک خێراتنی دەکات و دەڵێت: «بەخێر بێیت» یا « بەخێر هاتی».

هەندێک کەس پێیان وایە کورد شەڕ فرۆش و شەڕانگێزن و حەزیشیان لە دژایەتیی دەسەڵاتداریەتیی فەرمانڕەوایە. ئەم جۆرە بوختانەش

دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شۆڕشە هەمیشەییيانەی کوردان لە هەموو ناوچەکانی کوردستان بەرپایان کردووە و بۆ ناوبەناو پەیدابوونی دەستە و تاقمی چەتە و جەردە لە ناوچە کوردییەکاندا. بەڵام لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە لە ڕاستیدا بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ داننەنان بەمافە نەتەوەییەکانیاندا و بۆ هەڵسوکەوت و ڕەفتاری توندوتیژی کارمەندانی کارگێڕیی میری کە بەپێچەوانەی سروشت و ئاکاری کوردەوەن لەو دەوڵەتانەی کوردیان تێدان و ئەوانەش دەبنە هۆی وروژاندن و تووڕەکردنی کوردان.

هەرچی ناوبانگی کوردە کە بەدڵڕەقی ناوی دەرکردووە هەرگیز هیچ بنچینەیەکی نییە و بێگومان ئەوەش لەگەڵ سروشتی پرسۆزی کورددا ناگونجێ. ڕوونترین بەڵگەش لەو بارەوە وەک کەمبرلاند سەرنجی لێ داوە. نەبوونی وشەی کینەیە لە زمانی کوردیدا(٩٩). بەڵام کورد بێگومان بە زۆرئازایی بەناوبانگە و ئەگەر خۆ بخاتە نێو جەنگەوە بیر لە مردن ناکاتەوە و ڕەنگە ئازایی وی لەشەڕدا هۆی ئەو ناوبانگەی بێت.

هەرچەندە ئەو ژینگە و سروشتەی کە کوردی تێدا دەژی فێری قانوونەکانی ئابووریی کردووە- ڕەنگە هیچماڵێکی کورد نەبێت عەمباری دانەوێڵەی تێدا نەبێت- لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەکی زۆر هەر سەخی و چاوتێر و مێواندۆست ماوەتەوە. کورد بەدڵخۆشییەکی ڕاستەقینەوە پێشوازیی مێوان دەکات و هەرچی خۆراکیشی هەبێت تەنانەت ئەگەر وازی لە پارووی خۆیشی هێنابێ بۆ مێوانی دادەنێ. ئەو غەریبانەی ڕێیان دەکەوێتە گوندە کوردییەکان و دەچنە مزگەوتەکان بەبێ خۆراک نابن، ئیدی گوندییەکان یا دەیانبەنەوە بۆ ماڵی خۆیان یا خۆراکیان بۆ دەنێرنە مزگەوت.

هەرچی ئەو گەڕیدانەن کە کورد بەکەمدویی و بێدەنگی تاوانبار دەکەن و دەڵێن کورد واتەی گاڵتەوگەپ نازانێت بێگومان هەڵەن و لە بڕیارەکەشیاندا بەپەلەن. ئەم هەڵەیەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەستبەجێ لەگەڵ غەریباندا ناکرێنەوە. ئەزموونەکانی ئێمە ئەوەیان پێشان داوە کە

کـورد بەگـشت جـیـاوازییـەکی چینایەتی و ناوچەییـەوە یان تەنانەت دانیشتوانی گوندە دوورە دەست و گۆشەگیرەکانیش ڕۆحی گاڵتەوگەپێکی زۆریان هەیە. سەرباری ئەوەش مرۆڤی کورد مرۆڤێکی جێ بڕوا و بێ نیازە و حەزی لە خەڵەتاندن نییـە و تەنانەت ئەگـەر درۆیش بکات نازانێ چۆن درۆ دەکات[١٠٠]. هەروەها مرۆڤێکی دڵپاک و سۆزدارە. ئەدەبی گەلێریی کورد پڕە لە چیرۆکی جوانی خۆشەویستی. پەندێکی کوردیش هەیە دەڵێ: ئەگـەر کـورد وەرزێر یا شـوان نەبێت دەبێـتـە شـاعـیـر. بێگـومـان سـروشـتی جـوانی وڵاتەکـەیـان سـۆزیان دەبزوێنێ.. لە ڕاسـتـیـشـدا ئەدەبی عـارەبی و ئەدەبی فـارسی بەنووسـینی کوردی لە بارەی فەلسـەفە و مێژوو و شیعـر و ئەدەبەوە دەوڵـەمەند کراون. هەرچی ئەوانەشـە کـە فـەرهەنگێکی زانسـتی نوێـیـان وەدەست هێناوە توانسـتـێکی تایبـەتیـیـان لە بواری زانسـتی و میـکانیکدا دەرخسـتووە. بەکـورتی مرۆڤی کـورد مرۆڤـێکە خۆشی لەگەڵ دەگوزەرێت، دڵپاکە، چاوتێرە، بەخشندەیە، خێزان و وڵاتەکەی خۆی خۆش دەوێ و یەکجار سەربەرزیشە بەکوردیەتیی خۆیەوە. ئاشکراشە ئەو نووسەر و گـەڕیدانەش کـە کـوردیان بە ڕەوشت و ئاکـاری ناشـیـرین و خـراپ وەسف کردووە یا ڕاستی مەسەلەکەیان نەزانیوە یا دژایەتییان کردوون. لە هەردوو باریشدا وەسفەکانی ئەوان بایەخێکی زانستیی نییە.

٤

## پێوەندارییەتیی عارەب و کورد

ئەم باسکردنە خێرایەی بنەچەی کورد و نەتەوەکەیان و ڕێکخستنە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکانیان بەرەو دەستنیشانکردنی ڕێبازی پێوەندارییەتیی کورد و عارەبمان دەبات. پێش ئەوەی خۆ بخەینە نێو ئەم دەستنیشانکردنەوە دەبێ یەکەم پرسیارمان ئەوە بێت: ئایا پێوەندارییەتییەکی ڕاستەقینە لە نێوان عارەب و کورددا هەیە، بەتایبەت کوردە عێراقییەکان؟ سەردەمی نوێ کە ئازادی بۆ تاکەکانی گەلی عێراق گێڕایەوە ئەم بانگهێشتنەی کە لە کورد و عارەبەوە وەک یەک بەرز دەبێتەوە وەدی کرد، بانگهێشتنی برایەتی و یەکیەتی، هیچ یەکێکیش لەم دوو لایەنە بەبێ ویستی خۆی پالی پێوە نەنراوە بۆ ئەم هاریکارییە، ئایا ئەمە تەنێ موجامەلەیەکە لە عارەبەوە بۆ کورد و بەپێچەوانەشەوە؟

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە پێوەندارییەتی کورد و عارەب پێوەندارییەتییەکی ڕاستەقینەیە و شتێک نییە هەر لەخۆڕا بگوترێ. ئەم پێوەندارییەتییەش لەسەر بنچینەی مێژوویی و کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی بینا کراوە. بنچینە مێژووییەکانی ئەم پێوەندارییەتییە خۆ لەو مێژووە هاوبەشەدا دەنوێنێ کە هەر لە کاتی فەتحی ئیسلامیدا لە کوردستان لە سالی ١٨ی کۆچیدا عارەب و کوردی پێکەوە گرێ دا. ئیدی هەر لەو ڕۆژەیڕا عارەب و کورد هاوشانی یەک لە پێناوی بلاوکردنەوەی ئایینی ئیسلامدا جەنگاون. کوردەکان لە شۆڕشەکانی ئازادی بیردا وەک شۆڕشی قەرمەتییەکان (القرامطقه) و هی دیکەی وەک ئەواندا بەشداری

عارەبەکانیان کردووە. کوردیش ئەوەیان بەسە شانازیی پێوە بکەن کە لە نێوانیاندا سەلاحەدینی ئەیووبی دەرکەوتووە کە تەوژمی خاچهەڵگرانی لە لێشاوی بەسەردادانی ولاتانی عارەبدا ڕاگرت، ئەو تەوژمەی هەڕەشەی لە دەوڵەتی ئیسلامی لەنێو ماڵی خۆیدا دەکرد. دەوڵەتی ئەیووبییش لە سەلاحەدینەوە ئەرکی پاراستنی ولاتی عارەبی دژ بەخاچهەڵگران بەمیرات بۆ مایەوە. هەروەها کوردەکان لە پێناوی بەرگرتن لە شالاوی تەتەردا بەسەر ولاتی عارەبدا و بەتایبەت عێراق کۆششێکی زۆریان کردووە.

کوردەکان سامانێکی بیریی مەزنیان لە هەموو بوارێکی فەرهەنگدا وەک مێژوو و ئەدەب و شیعر خستۆتە سەر فەرهەنگی ئیسلامی و بەتایبەتیش فەرهەنگی عارەبی و ڕەنگە دیارترین نموونەش لەو بارەوە مێژوونووسی بەناوبانگ ئیبن خەلەکان بێت و هێشتاش کورد زۆر شتی دیکە دەخەنە سەر فەرهەنگی عارەبی. زۆر لەو ناوە پڕشنگدارانەی جیهانی شیعر و ئەدەب لە بنەچەدا کوردن. ئەحمەد شەوقی و جەمیل سیدقی زەهاوی و مەحموود تیموور و عەباس مەحموود ئەلعەقاد و مەعرووف ئەلڕەسافی هەموویان لە بنەڕتدا کوردن. ئەگەر بمانەوێ نێوی ئەو کەسانە بژمێرین کە ئەورۆ چالاکانە لە بلاوکردنەوەی فەرهەنگی عارەبیدا بەشداری دەکەن ئەوا لە پەلوپۆ دەکەوین. هەرچی پێوەندارێتیی کۆمەڵایەتییە کە کورد و عارەب پێکەوە گرێ دەدا ئەوا پەیدابوونی دەگەڕێتەوە بۆ هاوئایینییان و هاوژیانیان لە سایەی یەک سیستمی کۆمەڵایەتیدا و پێکەوە گرێدانیان کە بەرهەمی ژنخوازییە لە یەکدی.

بێگومان هاوئایینییان هۆیەکی گرنگە کە هەردوو گەلی پێکەوە گرێداوە و خەبات و ئامانجیشیانی یەکخستووە. لە ڕاستیدا کورد هەمیشە- و ئێستاش- لە خەڵکانی دی سوورتر و دڵگەرمتر بوونە بۆ ئایینی ئیسلام.

لەبەر پەیدابوونی ئایینی ئیسلامیش لە ولاتێکی عارەبیدا، ڕێزلێنانی عارەب و خۆشویستنیان لەلایەن کوردەوە کارێکی سروشتی بووە.

هاوبەشیکردنی هەردوو گەل لە یەک سیستمی کۆمەڵایەتیدا کەسیستمی

باوکزاڵییە کە لەسەر یەکیەتی خێزان و زاڵیی باوک وەستاوە. لە یەکدی نێزیک خستوونەتەوە. بێگومان ئەم هاوبەشییە هاوبەشیکردنی لە خوو و ڕەفتار و نەریتدا بەدوودا هاتووە کە لە یەک تێگەیشتنی لە نێوان هەردوو گەلدا هاسان کردووە. بێگومان ژنخواستن و مێردکردن لە نێوان عارەب و کورددا- کە لە سەرەتای فەتحی ئیسلامییەوە دەستی پێ کردووە و تا ئەمڕۆش بەردەوامە- پێوەندی نێوان هەردوو گەلی بەهێز کردووە.

تێکەڵبوونی هەردوو ڕەگەز بۆتە هۆی دروستبوونی گەلێک کۆمەڵی کوردی لە نێو کۆمەڵگەی عارەبیدا و گەلێک کۆمەڵی عارەبی لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا.

هەرچی پێوەنداریەتی ئابووریی نێوان کوردستانی عێراق و ناوچە دەشتاییەکەی عێراقە ئەوە زۆر ڕوون و لەبەرچاوە و لە پلەیەکی بەرزیشدایە. ئەو پێوەنداریەتییە توندە لە هۆیە گرنگەکان بوو کە کۆمیتەی کۆمەڵەی نەتەوەکان پشتی پێ بەست بۆ تێڕوانینی لە گیروگرفتی ویلایەتی مووسڵ. بەوەی کە گرێدانی ئەم ویلایەتەی- کە ناوچە کوردییەکەی دەگرتەوە- بەعێراق لە بری گرێدانی بەتورکیاوە پێ باشتر بوو(١٠١).

پڕانیی بازرگانی ناوچە کوردییەکە بە هەردوو بەشەکەیەوە هاوردن و هەناردن ڕاستەوخۆ بەناوچە عارەبییەکەوە بەستراوە. ئابووری هەر ناوچەیەکیش تەواوکەری ئەوی دیکەیە. لە ڕاستیشدا ئابووری چیایی پێویستی بە ئابووری دەشتایی هەیە و بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

سەرەڕای ئەمەش شوێنگەی دەڤەرە کوردییەکە گرنگییەکی بازرگانیی تایبەتی بۆ عێراق هەیە چونکە زۆربەی بازرگانیی ترانزێت کە لە ئێران و تورکیاوە دێت بۆ عێراق بە ڕێی کوردستانی عێراقدا تێدەپەڕێ و پێچەوانەشی هەر ڕاستە.

لەگەڵ دامەزراندنی پرۆژەکانی ئاودێریدا لە ناوچە کوردییەکە پێوەندی ناوچە عارەبییەکە بە ناوچە کوردییەکەوە قووڵتر بووەوە. زۆربەی

عەمبارەکان کە بەنیازی بەرگرتن لە لافاو و مسۆگەرکردنی هاوینە ئاو نەخشەیان کێشراوە لە ناوچە کوردییەکەدان وەک عەمبارەکانی دووکان، دەربەندیخان و بەخمە. هەرچی ئێشکچێتی و پارێزگاریشیانە کارێکە سەرەتا و کۆتایی بەکوردەکان سپێردراوە. ئەم پرۆژانەش بێگومان پێوەندی ناوچە عارەبییەکە بە ناوچە کوردییەکەوە پتەو دەکات.

هرچی پێوەنداریەتی سیاسی نێوان کورد و عارەبە بەرهەمی ئەو هەموو هۆکارانەیە لەسەرەوە باسکران و بەتایبەت مێژووی سیاسی هاوبەش لە نێوان هەردوو ڕەگەزدا لە ماوەی فەرمانڕەوایی دەولەتە ئیسلامییە جیاوازەکان و ماوەی دەسەلاتداریەتی دەولەتی عوسمانیدا.

عارەب و کورد چەند سەدەیەکی دوور و درێژ لە ژێر دەسەلاتداریەتی دەولەتی عوسمانیدا بوون و هەردوو پێکڤە خەباتی هاوبەشیشیان کردووە بۆ ڕزگاربوون لێی. کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەتێکشکانی دەولەتی عوسمانی کۆتایی هات ئاواتەکانی کورد و عارەب یەک بوون ئەویش ڕزگاربوون بوو لە دەسەلاتداریەتی عوسمانی بەتایبەت و بیانی بەگشتی و خۆبەڕێوەبردنی خۆیان لەلایەن خۆیانەوە. ئەگەر کورد لە دەستپێکی ئەو سەردەمەدا داوای دەولەتی سەربەخۆی خۆیانیان کردبێ ئەوە وەها ناگەیەنێ کە بەرژەوەندیان لەگەل بەرژەوەندی عارەبدا لە یەکیان دەدا، چونکە عارەب ڕۆژێک لە ڕۆژان نەیانویستووە کوردستان داگیر بکەن و بەبێ گوێدانە دانیشتوانی بیخەنە نێو خاکی خۆیانەوە. ئەگەر هەلومەرجی سیاسی پاش جەنگیش بوویێتە هۆی ئەوەی کوردستانی خواروو بخرێتە نێو عێراقەوە، ئەوە چ زیانێکی بەکورد نەدەگەیاند ئەگەر دەسەلات بەدەست حکوومەتگەلێکی نیشتمانپەروەر و گەلێرەوە بووایەت، بەلکە دەشکرا ئەم یەکیەتییە بۆ سوود و خێری هەردوو گەلی کورد و عارەب بەکار ببرێ. جیاوازی ڕەگەز لە نێوان کورد و عارەبدا ئەوە ناگەیەنێ کە کۆکردنەوەی هەردووکیان لە نێو یەک دەولەتدا کارێکی نەکردەنی بێت، چونکە نموونەی بەشداریکردنی پتر لە یەک ڕەگەز لەنێو یەک دەولەتدا زۆرە.

ئەم جۆرە یەکیەتییە لە زۆر لە دەوڵەتانی یەکگرتوو لە ئەوروپادا- وەک سویسرا کە فرانسی و ئیتالی و ئەڵمانی تێدا دەژی و چیکۆسلۆڤاکیا کە چیک و سلۆڤاکی تێدا دەژی و بەلجیکا کە فلامی و ڤالوونی تێدا دەژی و یوگۆسلاڤیا کە سەرب و سلۆڤاک و بولگاری تێدا دەژی- سەرکەوتووە.

نموونەش لە مەڕ ئەم جۆرە یەکیەتییانەش زۆرن و لە ژمارە نایەن. ئێمە دەگەڕێینەوە و سەرلەنوێ ئەوە جەخت دەکەینەوە کە ئەم یەکیەتییە نابێ بەتۆبزی بەسەر گەلاندا بسەپێندرێ، بەڵکە دەبێ لە خواستی خاوێنی خۆیان و بەرژەوەندی هاوبەشیانەوە بێت. وەک دەشبینین بنچینەی یەکیەتییەکانی ئەوروپا یەکیەتی نەتەوە و زمان نییە، بەڵکە بەپلەی یەکەم بەرژەوەندی هاوبەشە و نێزیکایەتی نەتەوە جیاوازەکانە لە یەکدییەوە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و بیرەوە. پێوەندی ئابووری نێوان ناوچە کوردییەکە و ناوچە عارەبییەکە پێوەندێکی توند و پتەوە و لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاوبەش دامەزراوە. دەکرێ لە بارەی پێوەندارییەتیی سیاسی نێوان هەردوو گەلیشەوە هەر ئەو شتە بگوترێ. داکۆکیکردن لە بەرژەوەندی یەکێک لەو دوو نەتەوەیە دەبێتە داکۆکیکردن لە بەرژەوەندی نەتەوەکەی دی. بێگومان ناوچە کوردییەکە قەڵایەکی قایمی داکۆکیکردنە لە عێراق و ڕووخانی ئەم قەڵایەش وەک مێژوو سەلماندوویەتی وەژوورکەوتنی دوژمن بۆ ناوچە عارەبییەکەی عێراق هاسان دەکات. سەیریش نییە مێژوونووسانی کۆنی ئیسلام نێوی ناوچە کوردییەکەیان ناوە عێراقی عەجەمی و ناوچە عارەبییەکەشیان ناو ناوە عێراقی عارەبی بەهۆی توندگرێدراویی هەردوو بەشەکە بەیەکدییەوە. ئەم پێوەندە سیاسییە لە نێوان ئەم دوو ناوچەیەدا، لە کاتی ئەو ڕاخوازییەدا دەرکەوت کە کۆمیتەی یەکیەتی نەتەوەکان بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ویلایەتی مووسڵ لە ساڵی ۱۹۲٥دا کردی بۆ ئەوەی ئایا ئەو ویلایەتە بخرێتە سەر تورکیا یا بخرێتە سەر عێراق.

زۆربەی زۆری دانیشتوانی کورد حەزیان بەوە کرد لەگەڵ عێراقدا یەکگرن بەڵکە هەندێ ناوچە وەک ناوچەی سلێمانی بەتەواوی دەنگی بۆ یەکگرتن

لە تەک عێراقدا دا[١٠٢]. ئەوەش کە گومانی تێیدا نییە ئەوەیە بوونی کورد و عارەب لەژێر دەستی بیانیدا و هەوڵدانی بەردەوامی هەردوویان بۆ ڕزگاربوون لێی پێوەنداریەتیی ڕۆحی و بەرژەوەندییەک کە پێکەوەیان گرێ دەدا بەهێزتر کرد.

ئەم یەکیەتییەی نێوان عارەب و کورد لەسەرەتادا بەهۆی دەوڵەتە کۆلۆنیالیستە گەورەکانەوە- و بەتایبەت بەریتانیا- کە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی مەزنی یەکەم بڕیاری چارەنووسی ئەو گەلانەی بندەستی دەسەڵاتداریەتی عوسمانییان دا، سەپێندرا. کوردەکانیش وەک گەلانی دیکەی بندەستی دەسەڵاتداریەتیی عوسمانی، وەک عارەب و ئەرمەن، ئاواتیان دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو کە هەموو پارچەکانی کوردستانی لەت لەتکراو بگرێتەوە. بەڵام تەونی تەڵەکە و پیلانی کۆلۆنیالیزمانە کە دەوڵەتە گەورەکان لە بنەوە دەیانچنی بۆ ئەوەی گەلانی چەوساوە بخەنە داوەوە، ئەو ئاواتانەی دامرکاندەوە ئەویش بە پشتگیریکردن لە بەشینەوەی کوردستان بەسەر سێ بەشی گەورەدا، بەشێکی ئێرانی و یەکێکی تورکی و سێیەمیشی عێراقی، سەرەڕای چەند بەشێکی بچووک لە ئەرمینیا و سووریا. بێگومان چاوەنواڕی ئەوەش نەدەکرا ئەم ئەنجامە ببێتە هۆی ڕەزامەندیی کوردان یا خۆشحاڵییان، بەتایبەت هەندێک لەو گەلانەی کە لە بندەستی دەسەڵاتداریەتیی عوسمانیدا بوون وەک دەوڵەتە عارەبییەکان و دەوڵەتی ئەرمەنی توانییان دەوڵەتی سەربەخۆ یا نیمچە سەربەخۆی خۆیان دابمەزرێنن. کاتێکیش هەوڵدانەکانی کوردان لە بواری نێونەتەوەییدا دۆڕا خۆیان لەبەردەم هەڵبژاردنی یەکگرتنی لەگەڵ عارەبدا یا لەگەڵ تورکدا بینییەوە، هیچ دوودڵییان لە جاڕدانی یەکگرتنیان لەگەڵ عارەبدا نەکرد. دەشبوو حکوومەتی عارەبی لە عێراقدا بۆ کوردانی بسەلمێنێ کە ئەو جێی بڕوای ئەوانە و هەڵبژاردنی هاوژیانیشیان لەگەڵ عارەبدا سەرکەوتووانە بووە و هەستی ئەوەشیان لا دروست بکات کە ئەوان لە ناوچەکەی خۆیاندا

بەڕاستی خۆیان خاوەنی دەسەڵاتن و بەڕاستیش لەگەڵ عارەبدا هاوبەشن لە دەوڵەتی عێراقدا، بەڵام مخابن ئەوە ڕووی نەدا. ئێمەش بێگومان ئەوە دەزانین ئەو حکوومەتانەی کە یەک لە دوای یەک هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە تا شۆڕشی ١٤ی تەمووزی زیندەوار دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، لەلایەن بیانی و بەرژەوەندە کۆلۆنیالیستەکانیانەوە بەڕێوە براون یا پیاوی ڕاست و زانا و دڵسۆزی ڕاستەقینەی وڵات کەم بوون، ئیدی ئەو مامەڵەیە کە کوردی پێ مامەڵە کراوە لە هەموو بۆنەیەکدا و بەرامبەر هەموو جۆرە داخوازییەک بۆتە هۆی بێ ئومێدییەکی زۆر کە دەگاتە ڕادەی پەشیمانبوونەوە لە هەڵبژاردنی ئەم چارەنووسەدا. حکوومەتەکانی پێشوو هێندە لووتبەرز و گەوەزە بوون کە چالاکانە و بەردەوام هەر کوردێک داوای چاککردنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی ناوچە کوردییەکەی کردبێ بە جیاخواز تاوانباریان کردووە. بەو جۆرە حکوومەتگەلی پێشوو لەبری ئەوەی هەوڵی بەهێزکردنی پێوەندی برایەتی نێوان هەردوو ڕەگەزی عارەب و کورد بدەن و بەوەش بناخەکانی یەکیەتییەکە پتەو بکەن، لە سیاسەتە چەوتەکانیاندا بەرامبەر بەکورد بەردەوام بوون و پلەر پێیان ڕاکێشا، بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشە ناوچەییەکان کە دەکرا بەبرێک لێزانی، دڵسۆزی، سەبر و وردبینی بەڕێگەی ئاشتی چارەسەر بکرێت بەشێوەیەک کە خاوێنیی دەروون بپارێزێ، لە بری ئەوە چەندین جاران گوندانی کورد بۆمباران کراون. لەگەڵ ئەوەشدا کە حکوومەتەکانی پێشوو هەڵەی زۆریان بەرامبەر عێراقییەکان کردووە، بەڵام خۆشبەختانە ئەوان هێشتا هەر خۆشەویستییان بەرامبەر عارەب هەیە، چونکە خەڵکە ڕۆشنبیرەکانیان هەمیشە ئاشکرایان کردووە کە ئەو حکوومەتانە نوێنەری گەلی عێراق نەبوون، بەڵکە نوێنەری خۆیان بوون و تەنێ نوێنەری بەرژەوەندی کۆلۆنیالیستەکان بوون. خۆشبەختانەش ڕۆژگار ڕاستیی قسەی ئەو خەڵکەی سەلماند و هەر کە عێراق ئازاد بوو ئیدی دەنگی عارەب کە بانگەوازی برایەتیی عارەب و کورد و یەکیەتی کورد و عارەبی دەکرد، بەرز بووەوە. زێدەڕۆیی نییە ئەگەر

بلێین زۆربەی کوردانی عێراق ئێستا لە ناخی دڵیانەوە پشتگیری یەکیەتی لەگەڵ عارەبدا لە سایەی کۆماری عێراقدا دەکەن، لە کاتێکدا لەسەردەمی ڕێژیمە لە نێوچووەکاندا جیابوونەوەیان لە عێراق پێ باشتر بوو، ئەگەر هەڵبژاردن بەدەستی خۆیان بووایە. دەبێ ئەم هەلە زێڕینە بقۆزرێتەوە و لاپەڕەیەکی نوێ لە لاپەڕەکانی یەکیەتی عارەب و کورد بکرێتەوە و پەردەش بەسەر ئەو سەردەمە دزێو و چەپەڵەدا بەهەڵە و کارە خراپەکانییەوە دابدرێتەوە، ئەو سەردەمەی گەلی عارەب یا کورد هیچ دەستێکیان تێدا نەبوو. خیانەتکارانی عارەب و کورد لە پشتگرتنی ئەو ڕێژیمە کۆنەدا لە یەک ئاستدا خیانەتیان دەکرد. گرنگ ئەوەیە لەو سەردەمە نوێیەدا یەکیەتی عارەب و کورد لەسەر بناخەیەکی ڕێکوپێک و پتەو دامەزرێنرێ کە لە هەڵەکانی سەردەمی کۆن و لە دەمارگیریی دزێو و کورتبینی بەدوور و خاڵیی بێ. بەڕای ئێمە دەبێ یەکیەتی عارەب و کورد ڕاستییەکی گرنگ لەبەرچاو بگرێت، ئەویش داننانە بەنەتەوەی کورددا داننانێکی ڕاستەقینە و تەواو، نەک داننانێکی ساختە وەک حکوومەتگەلی پێشوو دەیانکرد. یەکیەتی کورد لە تەک عارەبدا توانەوەی نەتەوەی کورد لەنێو نەتەوەی عارەبدا ناگەیەنێ چونکە ڕەگەزی کورد ڕەگەزی عارەب نییە و زمانی کوردیش زمانی عارەبی نییە.

گۆڕینی ڕاستییە زانستییەکانیش واتا دانانی کورد بەعارەب و سەپاندنی پەیڤین بەزمانی عارەبی بەسەریاندا و سەپاندنی شانازیکردن بەڕەگەزی عارەبەوە لەسەر حسێبی نەتەوە و ڕەگەزی خۆیان، هەڵەیە. بەڵام یەکیەتی کورد بەڕەزامەندیی خۆیان لەگەڵ عارەبدا شتێکی بەڵگەنەویستە کە دەیانکاتە بەهێزترین لایەنگری نەتەوەی عارەبی ئازاد. لەم حاڵەشدا دەبێ عارەبیش هەر بەو شێوە مامەڵەی کورد بکات و ببنە لایەنگرێکی ڕاستەقینەی نەتەوەی کوردی ئازاد، چونکە پێوەندی نێوان کورد و عارەب پێوەندیێکی بەرژەوەندی و ڕۆحییە و ئەمەش ئەو قانوونەیە کە بڕیاردەری پێوەندی هەر نەتەوەیەکە لەگەڵ نەتەوەیەکی دیکەدا لە جیهاندا. پێوەندی

گەلان بەهۆی تەفرەدانەوە پتەو نابێت، بەڵکە بەهۆی برایەتی و گۆڕینەوەی بەرژەوەندەوە پتەو دەبێت. داننانیش بە نەتەوەی کورددا بێگومان دەبێتە هۆی پتەوبوونی یەکیەتی کورد و عارەب.

پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی گشتی لە ناوچە کوردییەکە خۆیدا و لەگەڵ هاونیشتمانە کوردەکان خۆیاندا لەبارەی ئەو گیروگرفتانەی ئێستا تووشیان دەبێ و پێویستی بە چارەسەرێکی خێرا هەیە. ئەنجام بدرێ، بۆ ئەوەی حکوومەت چارەسەریان بکات. بێگومان هەمووان لەسەر ئەوە ڕێکن کە ئەم سەردەمە نوێیە دەبێ کاروباری لابردنی هۆیەکانی گلەیی و گازاندە و بێزاری وەئەستۆ بگرێ تا ئەو کاتەی ڕاستیی ئەو هۆیانە بۆ بەرپرسیاران ساغ دەبێتەوە. گازاندە و ناڕەزایەتی کوردان لە باری کارگێڕی و فێرکردن و پێویستی بێزاری ئابووری و فەرهەنگی و لەشساغی و... هتد گەلێکن و دەبێ حکوومەت بەپەلە پەنا بباتە بەر دانانی زمانی کوردی بەزمانی ڕەسمی لە هەموو فێرگە و خوێندنگە جیاوازەکاندا و لە تەواوی کارگێڕییە حکوومەتییەکانیشدا، دەبێ حکوومەت ژمارەی پێویست لە کوردان بۆ ئەوەی بۆ خۆیان ناوچە کوردییەکە بەڕێوەبەرن و بەشێوەیەکی فرەوانتر بەشداریی حکوومەتی نێوندەکی بکەن، مسۆگەر بکات.

لە دواییشدا دەبێ جارێکی دی ئەوە جەخت بکرێتەوە کە ڕێگە بە دووبارەبوونەوەی کۆنە هەڵەکان نەدرێتەوە. ئەمەش پێویستی بە لەبەرچاوگرتنی ڕاستییەکی مێژوویی هەیە، ئەو ڕاستییەش ئەوەیە کوردەکان کەمینەیەک نین لە کەمینە ڕەگەزییەکان کە هاتبن بۆ عێراق.

ئەوان دانیشتوانی بنچینەیی هەزاران ساڵەی ئەم ناوچانەن، مافەکانیشیان لە عێراقدا ڕێک لەگەڵ مافی عارەبدا پێکەڵە. مادام لەسەر هاوبەشییش لەم نیشتمانەدا پێکهاتووین دەبێ هەوڵی ئەوە بدەین چاکترین ڕێ بگرینە بەر بۆ پشتگریی لەم هاوبەشییە. نموونەی ڕوونیشمان لە سیستمی دەوڵەتانی یەکگرتووەوە هەیە کە فرەنەتەوەن و لەبواری پێشکەوتنی کارگێڕیدا وەپێش ئێمە کەوتوون. ئەگەر ئێمە بمانەوێ بینای

دەوڵەتەکـەمـان لەسـەر بنـاخـەیەکی بتـەو دابمەزرێنین کـە هەوا و هەوەس و تەماحی کەسێـتی جێلەقی نەکات و تـێپەڕبوونی ساڵانیش کار نەکاتە سەر هێز و پتەویی، چاکتر وایە ئێمە بەگوێرەی هەلومەرجی خۆمان هەوڵی ئەوە بدەین سوود لە ئەزموونەکانی دەوڵەتانی یەکگرتووی فرەنەتەوە وەرگرین.

## پەراوێزەکان


1- Safrastian, Dr, A., "Kurdistan and the Kurds" , London 1984, pp. 15- 16.

2- Driver, G, R., "The name Kurd and its phylological connexions", Journal of Royal Asian Society., part 3, 1923. pp. 40- 44.

٣- هەمان سەرچاوە ل٤٠٢..

4- Xenephone, "The Persian expedition", Translated by Rex Warner. pengwin Books, pp. 127- 145.

5- Driver, op. cit., p. 393.

6- Safrastian, op, cit., p.16

٧- الأمير شرف خان البدليسى: الشرفنامه، بغداد ١٩٥١ ص١٢(ترجمها عن الفارسيه محمد جميل بندى الروژبيانى).

٨- هەمان سەرچاوە ل ٢٠.

9- Minorisky," The Encyclopeadia of Islam" ,(The Kurds) London 1925 (origin).

10- Nikitine, B., "Le Kurdes" , paris 1956, pp. 12 -13.

11- Driver, op. cit., p. 379.

12- Minorisky, op. cit.

13- Coon, C,s,.. "Caravan: the story of the Middle Edst" London 1951, p. 75.

14- Safrastian, p. 94.

15- Coon, p. 75.

16- Field, H., "Anthropology of Iraq" , , part 2, No 2, Harvard University 1952, pp. 56- 61.

17- Foreign office, "Armenia and Kurdistan" London 1921. p. 4

18- Safrastian, pp. 101- 102.

19- Cambridg Ancient History, Bol. p423.

20- Cambridge Ancient History, Vol 3, p223.

21- See: Herodotus, "the hstory of Herodotus" , London 1912, pp. 51-54 (Translated by Ceorge Rawlinson) Every Man,s Library.

22- Driver. G, R.," The dispersion of the Kurds in ancient time" Journal of Royal Asian Society, part 4, 1921, pp. 363- 72.
23- Le Strange, G., " The land of the Eastem Caliphet" , Cambridge 1905, p. 185.
24- Ibid., p. 192.
25- Minorisky, op. cit.
26- Nikitine, op, cit, p. 23.
27- Minorisky, op. cit.

٢٨- الشرفنامه ص ٢٠- ٢١.

29 Minorisky, OP. cit.
30- Ibid.
31- Edmunds, C, J., "Kurds, Turks and Arabs" , London 1957, p.2.
32- Nikitine, p. 38.
33- League of nations," question of frontier between Turkey and Iraq", Geneve 1927, p. 29.
34- Nikitine, p. 42.

٣٥- تأريخ الكرد وكردستان، لمحمد أمين زكى و ترجمة محمد على عوني، القاهرة ١٩٣٩ص ٣٩.

36- Bulletin do Centre d'etude Kurdes, paris 1948.
37- Nikitine, pp. 38- 39.

٣٨- بگەڕێوە بۆ: تأريخ الدول والإمارات الكردية في العصر الإسلامي ألفه بالكردية محمد أمين زكي وترجمه الى العربية محمد علي عوني، القاهرة ١٩٤٥. ديسان بگەڕێوە بۆ:

Minorisky, The Encyclopeadia of Islam- The history of the Kurds.
39- Minorsky, Ibid.
40- Safrastian, p. 45.
41- Safrastian, p. 103.

٤٢- هەمان سەرچاوە.

43- Safrastian, p. 56.
44- Soane, E, B.," To Mesopotamia and Kurdistan in disguise" , London 1926, 2nd ed., p. 156.

٤٥- القضية الكردية، تأليف بلج شيركوه، القاهرة ١٩٣٠، ص٤٠.

46- Parlimantary Papers, Turkey, No 11, 1881, pp. 370- 375.

47- Foreign office handbook, " Turkey in Asia" , No 58, London 1920.

48- Pa rlimantary Papers, op. cit., pp. 282- 283.

ئەوەی لەم سەردەمەدا دێتە پێش چاو تێکچوونی پێوەندارییەتی نێوان کورد و دیانەکانە بەدنەدانی حکوومەتی عوسمانی. هەروەها پێکدادانی کورد و ئەرمەنە. دوکتۆر سافراستیان داکۆکی لە نۆرەی کورد لەو پێکدادانانەدا دەکات و تەواوی تاوانەکەش دەخاتە ئەستۆی حکوومەتی عوسمانی. (Safrastian, p. 7)

49- Edmunds, C, J., "Kurds, Turks and Arabs" , p. 59.

هەرچی ئەو گۆڤارەیە ناوی کوردستان بوو و بنەماڵەی بەدرخان لە قاهیرە دەریان دەکرد.

٥٠- پەیمانی سیڤەر کە لە نێوان هاوپەیمانەکان و تورکیادا لە ئابی ١٩٢٠دا مۆر کرا بڕیاری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی دا بەم شێوەیەی خوارەوە:

بەندی ٦٢: کۆمیتەیەکی پێکهاتوو لە سێ ئەندام کە حکوومەتەکانی بەریتانیا و فرانسە و ئیتالیا دەستنیشانیان دەکەن و ئیستەنبوول دەکاتە نێوەندی خۆی لە ماوەی شەش مانگدا لە دوای جێبەجێکردنی پەیمانەکە. نەخشەیەک بۆ سەربەخۆیی ئەو ناوچانەی کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی فرات و باشووری سنووری خوارووی ئەرمینیا کە پاشان بڕیاری لەسەر دەدرێ و باکوری سنووری تورکیا لەگەڵ سووریا و عێراقدا و کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن. دادەنێ.

ئەم نەخشەیەش دەبێ مافی کەمینە ئاشووری- کلدانی و کەمینە ئایینییەکانی دیکە کە لە ناوچەکەدا دەژین مسۆگەر بکات.

بەندی ٦٣: حکوومەتی تورکی بەجێبەجێکردنی بڕیارەکانی هەردوو کۆمیتەی نێوبراو لە بەندی ٦٢دا لە ماوەی سێ مانگدا لە ئاگادارکردنەوەی بەبڕیارەکانیان قایل دەبێت:

بەندی ٦٤: ئەگەر دەرکەوت زۆربەی گەلی کورد وەک لە بەندی ٦٢دا دیاری کران لە ماوەی یەک ساڵدا ئارەزووی جیایی و سەربەخۆییان لە تورکیا پێشان دا و ئەگەر ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکانیش وای دانا کە ئەم گەلە دەتوانن سەرخۆ بژین، ئەو حەلە تورکیا بەبڕیارەکانی ئەنجوومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان

قـــايل دەبێت و لە گـــشـت مـــاف و ســـامـــانێکی خـــۆی لەم ناوچەیە دەست هەڵدەگرێ.

51- Foster, H, A.," The making of Iraq". London 1936, p. 152.

52- Maine, E., "Iraq", London 1937, p. 134.

53- Wilson, A, T., "Mesopotamia 1917- 1920, a clash loyalities" London 1931. p 141- 142.

٥٤- بۆ زانیاری زۆرتر بگەڕێوە بۆ : مـشـکلة الموصل، تألیـفا لدکـتور فـاضل حسین، بغداد، ١٩٥٥، ص ٣٠١ (لە لاپەڕە ٣٣ی کتێبەکەدا لە دوای پەراوێزی ژمارە ٥٣ ژمارە پەراوێزی ٥٥ دانراوە واتە ژمارەی ٥٤ بۆ پەراوێز دانەنراوە کە ئیـ.ی هەڵەی چاپە یا نووسەر لە بیری چووە نازانم؟ من ژمـارە پەراوێزی ٥٥ م کـرد بە٥٤ و ٦٥ بە ٥٥ و... هتد ئیدی بەو جۆرە- وەرگێڕ).

55- Elphinston, W, G., "Kurds and Kurdish question" Journal of the Royal Central Asian Society, Vo l 35, pp. 38- 51.

٥٦- هەمان سەرچاوە.

57- Safrastian, p 86.

58- Elphinston, op. cit.

٥٩- سەرچاوەی پێشوو.

60- Roosevelt, Jr., A., " The Kurdish Republic of Mahabad" , Midle East Jourmal. No 3, Vol 1. 1947, p. 262.

61- Douglas, W,O., "Strange Iands and Friendly people", New York 1951. p. 64.

62- His Magesty's Government, "Progress of Iraq between 1921- 1930", London 1931, p. 255.

٦٣- مذکرات - تألیف رفیق حلمي، ترجمها الی العربیة محمد جمیل الروژبیاني، بغداد 1957، ص 69 - 70 (الجزء الأول).

64- Maine, op. cit.,p. 136.

٦٥- کاردۆ بەم وشانە باسی کارەکانی کە هێزی هەوایی بریتانی ئەنجامی د ، دەکات: «ئەو کـارانە (عـمـلیـات) بەبێ ئەوەی کـە فـڕۆکـەکـانمان تووشی مـەترسی بکەن دەرفەتێکی نایابیان بۆ مەشقی هێزی هەوایی ئیمە ڕەخساند».

Garrod, G, R., "Recent operations in Kurdistan". Journal of Roval United Service Institute, May 1933, No 510. p 236.

٦٦- بگەڕێوە بۆ کتێبی: مأساة بارزان المظلومة، بقلم معروف چیاووك، بغداد ١٩٥٤.

67- See: Longrigg, S, H., "Iraq 1900 - 1905, Oxford 1953 (Royal Institute of International Affairs). pp. 324- 328.

68- Khadoori, M., "Independent Iraq". London 1951, (Royal Institutue of International Affairs), p. 63.

69- Edmunds, C, J., " The Kurds of Iraq", Middle East Journal., Vol 11, No 1, 1952, p.52.

٧٠- الأطلس الإداري لأحمد سوسة ص٣، بغداد ١٩٥١. (له لاپەڕە ٤٣ی کتێبەکەدا و له خشتەکەدا پانایی زەوی کشتوکاڵی پارێزگەی نەینەوا ٢٩٧٧٠ کم٢ەو پانای زەویی چێندراو ٢٩٠٥٨کم٢ەو ڕێژەی زەوی چێندراو لەگەڵ پانایی گشتیی زەوی کشتوکاڵیدا ٥٣٪ بەگوێرەی ئەو دوو ژمارەیەی کە پانایی زەویی کشتوکاڵی و پانایی زەویی چێنراو پێشان دەدەن ڕێژەی زەویی چێنراو لەگەڵ پانایی گشتیی زەویی کشتوکاڵیدا دەبێ بکاتە ٩٧٠٦ لەو حاڵەشدا دەبێ ئەو ڕێژەی ٥٣٪یە هەڵە بێت. ئەگەر ئەو ڕێژەی ٥٣٪-ە یش ڕاست بێت، ئەوا دەبێ پانایی زەویی چێندراو بکاتە ١٥٧٧٨کم٢ واتە دەبێ لەو ژمارەیەی کە لە کتێبەکەدا هاتووە کەمتر بێت- وەرگێڕ).

Iand tenure and related questions" Cair 1931, p.11. 71- Dowson, E., "Enquiry into

٧٢- المجموعة الإحصائية لعام ١٩٥٤ص ٧٢ الجدول ٩٨ و ٩٩.

٧٣- له الإحصاء الزراعی- الحیوانی، ساڵی ١٩٥٢- ١٩٥٣ وەرگیراوە.

٧٤- سەرچاوەی پێشوو. (لە لاپەڕە ٤٥ی کتێبەکەدا نووسەر پەراوێزی ژمارە ٧٤ و ٧٥ی کە لە وەرگێڕانەکەدا بوون بە ٧٣ و ٧٤ بۆ دووخشتەی داناون یەکەمیان شینایی هاوینە و دووەمیان درەختی میوە کە بەگوێرەی نووسەر بۆ ساڵی ١٩٥٤ ن بەڵام سەرچاوەی خشتەکان ئاماری کشتوکاڵی- ئاژەڵی ساڵی ١٩٥٢- ١٩٥٣ن ئەوجا من پێم وایە کە ئەو ساڵی ١٩٥٤یە دەبێ هەڵە بێت و خشتەکە هی ساڵی ١٩٥٣ بێت چونکە سەرچاوەی خشتەکان ئاماری ١٩٥٢- ١٩٥٣ن- وەرگێڕ).

٧٥- المجموعە الإحصائیە ساڵی ١٩٥٤، ل ٦٥.

76- Warriner, Doreen., "Land reform and development in the Middie East" , London 1957, p.137.

٧٧- له الإحصاء الزراعي- الحيواني، سالّى ١٩٥٢- ١٩٥٣ وەگيراوه.

78- Lord Salter. " The development of Iraq" Baghdad 1954. p. 198.

79- International Bank for Reconstruction and development " The eco nomic development of Iraq" ,Baltimore 1952, pp. 240- 242.

٨٠- المجموعة الإحصائية السنوية لعام ١٩٥٤ص ١٤٣.

٨١- المجموعة الإحصائية السنوية العام ١٩٥٤ ص ٦٣- ٦٥.

82- Adams. D.. "Current population in Iraq", Middle. East Journal, Vol 10, No 2, 1956.

83- United Nations, " The determinent and Consquences of population trend" , New York 1953, P. 65.

٨٤- حالة العراق الصحية في ربع قرب- للدكتور درهاكوبيان، الموصل ١٩٤٧ ص ٧١- ٧٢.

٨٥- المجموعة الإحصائية السنوية لعام ١٩٥٤ ص ٢٦٣- ٢٦٥.

86- Warriner, D., "Land and poverty in the Middle East", London 1948, p. 2.

(له لاپەڕە ٥٩ی کتێبەکەدا نووسەر نیشانەی ئەستێرە(*)یەکی داناوە لە پەراوێزیشدا بۆ ئەو ئەستێرە(*)یە ناوی ئەو سەرچاوەیەی سەرەوەی نووسیوە. دەبوو لە بری ئەو ئەستێرەیە ژمارەیەکی دانابا کە بەگوێرەی نووسەر ژمارە ٨٧ دەبوو بەلاّم لە وەرگێڕانەکەدا ئەستێرەکەم کردە ژمارە و ژمارەکەش بە من بوو بە ٨٦ و پەراوێزەکانی دیکەی دوای ئەوەش ژمارەکانیان وەک خۆیان دەمێنێتەوە- وەرگێڕ).

87- Ghalib, Dr Ali "Malaria in Iraq "Baghdad 1944, p 33.

٨٨- المجموعة الأحصائية الصحية لعام ١٩٥٣- وزارة الصحة ص ٥٩- ٦١.

٨٩- لە المجموعة الإحصائية السنوية لعام ١٩٥٥وەرگێراوە.

٩٠- المجموعة الإحصائية السنوية لسنة ١٩٥٤ ص ٨ الجدول ٥. (سەرجەمی نەخوێندووانی نێر و مێی پارێزگەی سلێمانی دەکاتە ١٧٤٩٣٤ نەک ١٧٤٩٣٧ وەک لە کتێبەکەدا هاتووە- وەرگێڕ).

٩١- المجموعة الإحصائية السنوية لعام ١٩٥٤ص ٥٨- ٥٩ الجدول ٧٥ و ٢٨.

92- Leach, E, R., "Social and economic organization of Rawunduz Kurd London 1940, pp. 11- 12.

٩٣- لە کتێبێکی دەسنووسی مامۆستا شاکر فەتاحەوە بەناوی عقره ل ٦٦.

94- Barth, F,.. "Principles of social organization in southern kurdistan" , Oslo 1953, p. 15.

٩٥- بۆ نموونه بگەڕێوه بۆ:

Creage, J., "Armenians Koords and Turks" . London 1880, Vol 11. pp.

227- 257 and pp. 261- 279.

Fowler, George," Three Years in Persia," London 1841, Vol 11.

Wagner, Dr, M.," Travels in Persia, Georgia and Kurdistan" , London 1856, Vol 3, pp. 264- 266.

Layard. Sir Henry "Nineveh and its remains" , London 1849, Vol. 1,p. 239- 242.

96- Rich, c, J., A narrative of a residence in Kurdistan 2, London 1836, Vol 1,p. 104.

97- Binder, H., "Au Kurdistan", Paris 1887, P. 110.

98- Soane, pp. 394- 396.

99- Cumberland, R, C., " The KURDS". The Moslem World, Vol 16,p. 152, 1926.

100- Mrs, Linfield Soane., "Arecent journey through Kurdistan" ,

Journal of Royal Central Asian Society., Vol 22, 1935.

101- See: League of Nations: " The question of Frontier between Turkey and Iraq" Geneve 1927.

١٠٢- بگەڕێوه بۆ ڕاپۆرتی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە بارەی کێشەی مووسڵەوە.

## سەرچاوە گەلێک کە لە کتێبەکەدا نێویان هاتووە

### أ. بەزمانی عارەبی

أمير شرف خان البدليسي: الشرفنامة، ترجمها عن الفارسية محمد جميل الروزبياني، بغداد ١٩٥١.

بلج شيركوه: القضية الكردية، مترجمة عن التركية، القاهرة ١٩٣٠.

الدكتور در هاكوبيان: حالة العراق الصحية في ربع قرن، الموصل ١٩٤٧.

رفيق حلمي: مذكرات، الجزء الأول، ترجمها عن الكردية محمد جميل الروزبياني، بغداد ١٩٥٧.

الدكتور فاضل حسين: مشكلة الموصل، بغداد ١٩٥٥.

محمد أمين زكي: تأريخ الكرد و كردستان، ترجمة عن الكردية محمد علي عوني، القاهرة ١٩٣٩.

محمد أمين زكي: تأريخ الدول والإمارات الكردية، ترجمة عن الكردية محمد علي عوني، بغداد ١٩٤٥.

معروف جياووك: مأساة بارزان المظلومة، بغداد ١٩٥٤.

وزارة الإقتصاد: المجموعة الإحصائية السنوية لعام ١٩٥٤ و ١٩٥٥.

وزارة الإقتصاد: الإحصاء الزراعي الحيواني لعام ١٩٥٢- ١٩٥٣.

وزارة الصحة: الإحصاء الصحي لعام ١٩٥٣.

### ب- بەزمانی بیانی

Adams. D.. “Current population in Iraq” , M. E. J, Vol 10, No 2, 1956.

Barth, F... “Principles of Social organization in southern Kurdistan” , Oslo. 1953.

Bulletin de Centre d’etude Kurdes, Paris 1948.

Cambridge Ancient history,Vol 1& 3, Cambridge 1924.

Coon, C, S,.. “Caravan: the story of the Middle Edst” ,London 1951(2nd edit).

Creage, J., “Armenians Koords and Turks”. London 1880, Vol 11.

Cumberland, R,C., “ The Kurds” , The Moslem World, Vol 16, 1926.

Dowson, E., "Inquiry into land tenure and related questions" Cairo 1931.

Douglas, W. "Strange land and Friendly people", New York 1951.

Driver, G. R. "The dispersion of the Kurds in ancient time" J, R, A, S., Part 4, 1921.

Driver, G R. "The name Kurd and its phylological connexion" J, R, A, S., Part 3, 1923.

Edmunds, C, J., "Kurds, Turks and Arabs", London 1957.

Edmunds, C, J., "The Kurds of Iraq", M, E, J., Vol 2, No 2, 1957.

Elphinston, W, G., "Kurds and kurdish question", J, R, A, S., Vol 35, 1948.

Field, H., "Anthropology of Iraq", Harvard 1951, Part, 2.

Foreign Office, "Armenia and Kurdistan", London 1921.

Foreign Office handbook, "Turkey in Asia", London 1920.

Foster, H, A., "The making of Iraq" London 1936.

Ghalib, Dr Ali "Malaria and Malaria in Iraq" Baghdad 1944.

Garrod, A. G, R., "Recent operations in Kurdistan", J, R, U, S, I., No 510, 1933.

His Magestys Government, "Report on the progress of Iraq between 1921 - 1930", London 1931.

Herodotus. "The history of Herodotus", London 1921 (Enery Man's Library).

International Bank for Reconstruction and development "The development of Iraq", Baltimore 1951.

Khadoori, M., "Independent Iraq", London1951.

Laqueure, W, Z., "Communism and Nationalism in the Middle East" London 1957 (2nd Ed).

Layard, H, "Nineveh and the remains", London 1849.

League of nations, "Question of frontier between Turkey and Iraq", Geneve 1927.

Le Strange, G., "The land of the Eastern Caliphet", London 1905.

Leach, Dr, E, R., "Social and economic organization of Rawunduz Kurds", London 1940 (London School economics).

Linfield, Mrs, Soane., "A recent journey through Kurdistan", J, R, C, A, S., Vol 22, 1935.
Longrigg, S, H., "Iraq 1900 - 1905" London 1953 (Royal Institutue of International Affairs).
Maine, E., "Iraq", London 1937.
Minorisky, "The Kurds", Encyclopeadia of Islam, London 1925.
Nikitine, R., "Le Kurdes", Paris 1956.
Parlimantary Papers, Turkey, No 1, London 1881.
Rich, C, J., "A narrative of a residence in Kurdistan", London 1836, Vol 1.
Roosevelt, A, Jr., "The Kursish Republic of Mahabad", M, E, J., No 3, Vol 1, 1947.
Safrastion, Dr, A., "Kurdistan and the Kurds", London 1948.
Lord Salter, "The development of Iraq" Baghdad 1954.
Soane E, B., "To Mesopotamia and Kurdistan in disguise", London 1926 (2nd ed).
United Nations, "The determinent and consquences of population trend", New York 1951.
Wagner, Dr, M., "Travels in Persia, Georgia and Kurdistan", London 1856 (2nd vol).
Warriner, Dr. D., "Land reform and development in the Middle East", London 1957.
Wilson, A, T., "Mesopotamia 1917 - 1920, a clash of loyalities" London 1931.
Xenephone, "The Persian expedition", (Translated by Rex Warner, Peng Books).

# پێرست